

# العذر بالجهل

## کۆکەرەوە لە وتەی زانایانی دەعوە لەباسی جەهل لە شیرکی گەورەدا


کۆکردنەوە و تعلیق

**الشيخ علي بن خضير الخضير**

الله تعالى ئازادی بکات

وەرگێڕانی

**هاوکار کوردی**


هاوکار

2019 - 1440

# العذر بالجهل

کۆکەرەوە لە وتەی زانایانی دەعوە لە باسی جەهل لە شیرکی گەورەدا

کۆکردنەوە و تعلیق

## الشیخ علي بن خضیر الخضیر

الله تعالی ئازادی بکات

وەرگێڕانی

## هاوکار کوردي

١٤٤٠ هـ - ٢٠١٩م

## کورتەیەك لە ژیانی (الشیخ علی بن خضیر بن فهد الخضیر) الله تعالی ئازادی بکات

ناوی : علی کوڕی خوزەیری کوڕی فەهدی کوڕی خوزەیر لە ساڵی : ١٣٧٤ کۆچی لەشاری ڕیاز لە پایتەختی وڵاتی حیجاز لە دایك بووە ئێستا پێی دەڵێن : مەملەکەتی عەرەبـی سعودی



### ژیانی زانستی شێخ :

لە ساڵی ١٤٠٣کۆچی بەرامبەر ساڵی ١٩٨٣ میلادی لە زانکۆی ئیمام لە شاری قەصیم لەبەشی " أصول الدین " تەواوی کردووە.

پاش تەواوکردنی زانکۆ بۆتە کاتب عەدل لە دادگای مەکەی پیرۆز.کە لە نێوان ساڵەکانی ١٤٠٦ تاوەکو ١٤٠٨ کۆچی.لە پاشاندا هەڵبژێردرا بۆ قازی شاری مکە.بەڵام دواتر ڕەفز کرایەوە.لە لایەن وەزارەتی عەدل و دواتر نەقڵ کرا بۆ وەزارەتی ڕۆشنبـیری وەك مامۆستایەك لە قوتابخانەکان.

وە لەهەمان کاتدا ئیمام و خەتیب بوو لە مزگەوتی " الدغیشم بالصفراو" لەشاری بورەیدە.

وەهەروەها دامەزرێنەری کۆمەڵی قورئان خوێنان و سەنتەرەکانی قورئان بووە.وە چەندی کۆڕ و دەرس و وانە وتنەوەی هەبوو لە بابەتەکانی تەوحید و عەقیدە و فیقهی ئیسلامی.وە بۆتە هاوکاری زۆرێك لە حاجیان وەك مورشید و موفتیەکی دینی بە تەکلیفی هەندێك لە شێخانی شاری قەصیم وە لەوێ چەندین وتار و محازەرە و کۆڕی زیکری بۆ حاجیــــەکان و عومــــرەکاران بەستووە.وە بابەتەکانی مەرج و ئەرکان و

واجیبـــــــات و ئەوانەی حـــــەج بەتاڵ دەکـــــــەنەوە بۆ حاجیەکانی شەرح کردووە.

ڕێگای پێدرابوو بەفتوا و وەڵامدانەوەی ئەم بابەتە ئاڵۆزانەی لە بابەتەکانی فیقهی و عیلمی لەبەردەم شێخ ئیبن باز وەڵامی دەدایەوە و شێخ ئیبن بازیش پێی سەرسام بوو بەو زیرەکیەی شێخ وە شێخ ئیبن باز ئەوی کردبوو بە سەرچاوەیەك لە بابەتی عەقـــــــیدە و تەوحید وە بە ڕوونکـرەوەیەکی چاکی سوونەت و شەریعەت و بنەماکانی ئینی دادەنا.

## مامۆستایەکان و چۆنیەتی داواکردنی زانست :

هەر لە سەرەتایی گەنجیەوە دەستی بە خوێندنی زانستی شەرعی کردووە.ئەویش لە کاتێکدا لە مەرحەلەکانی ناوەندی بووە.یەکەم شت کە دەستی پێکرد خوێندنی قورئان و تجوید و لەبەرکردنی بووە لەسەر دەستی شێخ عبدالرؤف الحناوی پێش ئەوەی بچێتە زانکۆ لەلایەن هەریەك لە شێخ علی بن عبداللە الجردان و شێخ قازی محمد بن مهیزعی خوێندووە.

وە دەرسەکانی تەوحید و عەقیدە و چەندین زانستی تری لەلای شێخ حمود بن عقلاء الشعبـي خوێندووە.وە هەروەها شێخ حمود پێشەکی بۆ سێ لە کتێبەکانی نووسیوە ئەویش کتێبەکانی : الجمع والتجرید فی شرح کتاب التوحید وە الحقائق فی التوحید وە التوضیح والتتمات علی کشف الشبهات.

وە زانستەکانی : تەوحید و فیقھ و فەرائیز و فەرمووده و نەحوی لای شێخ محمد بن صالح المنصور نزیکەی چوار ساڵ لای خوێندووە.

وە هەروەها نزیکە چوار ساڵ لای شێخ ابن عثیمین–ی خوێندووە.

وە دەرسەکانی فیقهی لای شێخ عبداللە بن محمد بن عبداللە ال حسین خوێندووە.

وه كتێبەكانی تەزكیە و زوهد هەریەك لە كتێبەكانی ( كتاب الزهد لوكيع والورع الاحمد بن حنبل ) لای شێخی زاهید محمد بن سليمان العليط خوێندووە.

## وتنەوەی زانستە شەرعیەكان :

شێخ علی خاوەنی چەندین دەرس و محازەرە و شەرح كردنی زانستە شەرعیەكانە لە بابەتەكانی تەوحید و عەقیدە و فیقه.وەیەكەم جار كە دەستی كرد بە وانە وتنەوە لە مزگەوتەكان لەساڵی ١٤٠٥ كۆچی بوو كە دەرسەكانی فیقه و زارەوەكانی فەرموودە ئەگەرچی قوتابیەكانی لە پێنج كەس تێبەڕی نەدەكرد بەڵام شێخ زۆر چالاك و بەردەوام بوو لە وانە وتنەوە تاوەكو ئێستا.

وتنەوەی دەرسەكانی بەشێوەی گشتی لە پاش نوێژی بەیانی و پاش عیشا بووە.لەژێر دەستی شێخ چەندین زانا و قازی و بانگخواز و ئەهلی علم پەروەردە بووە.

## كتێبەكانی :

شێخ خاوەنی كۆمەڵێ كتێبی زۆر گرنگە كە بەڕاستی پێویستە قوتابی زانستی شەرعی لێیان ئاگاداربیت ئەوانیش :

یەكەم : المعتصر شرح كتاب التوحيد.

دووهەم : الوجازة في شرح الأصول الثلاثة.

چوارەم : الوسيط في شرح أول رسالة في مجموعة التوحيد.

پێنجەم : الزناد فی شرح لمعه الاعتقاد.

شەشەم : كتاب الجمع والتجريد فی شرح كتاب التوحيد.

حەوتەم : كتاب التوضيح والتتمات على كشف الشبهات.

هەشتەم : حقائق التوحيد.

نۆیەم : قواعد وأصول في المقلدين والجهال في الشرك الأكبر والبدع.

دەیەم : القواعد الأربع في التفريق بـين دين المسلمين ودين العلمانيين.

یازدەهەم : الطبقات.

دوازدەهەم : المسائل المرضية على العقيدة الواسطية.

سێزدەهەم : رسالة في بـيان حال طائفة العصرانيين.

چواردەهەم : المحكي فيه الاجماع من الأحكام الفقهية.

پازدەهەم : أصل دين الاسلام.

شازدەهەم : أصول الصحوة الجديدة.

حەڤدەهەم : دفاع عن الشيخ حمود بن عقلاء الشعبـي.

هەژدەهەم : الرد على الامامية المعاصرة.

نوزدەهەم : اقتراح في تدريس الفقه.

وە شێخ خاوەنی دوو لاپەڕەیە لە گۆگڵ :

یەکەم : موقع مكتبة صيد الفوائد.

دووهەم : موقع منبر التوحيد.

کە تێیدا هەموو کتێب و وانە دەنگیەکانی تێدایە ، ئێستاکە لە زیندانە بەهۆی فەتوای خروج لە تاغوتانی ال سلول وە لە سعودیا بە کەسێکی خواریج ناسراوە کە دیارە ئەوانە شتی دوورن لە ڕاستیەوە ، تەنها بۆ ناشرینکردنیەتی .

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشەکی وەرگێڕ :**

**الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله وغلى اله وصحبه ومن ولاه أما بعد :**

**بابەتی (عذر بجهل في الشرك الأكبر) و تەكفير بابەتێكی زۆر ئالۆزە یەكێك زۆر ورد نەبێت لە بنەما و یاساكانی ئەم زانستە تێدەكەوێت.كاتێك دەبینین كەسانێك زۆر زیادەڕۆیان كردووە و بەرەو غلو ڕۆشتوون هیچ كەسێك لێیان سەلامەت نیە، وە كەسانێكیش كەم تەرخەمیان لێكردووە دەبینین كافر و موسڵمان لەیەك جیا ناكاتەوە وە نازانێت دەبێ كێ كافر بكات و كێ موشریك، هەموو لایەكی تێكەڵ كردووە لە ئەنجام بەهۆی تەكفیرنەكردنی كافرانێك خۆی كەوتۆتە ناو كوفرەوە، وە كەسانێكیش لەوان بەدبەختر ئەوانەن كە عوزر بۆ موشریك و كافر دەهێنەوە پێیان دەوترێت (عاذر) ئیشی ئەو كەسە تەنها ئەوەیە ببێتە پارێزەر بۆ كافران و موشریكان، كاتێ كەسێ دەبینی دەڵێت كاكە ئەوە كافرێكی موشریكە و هاواری غەیری الله تعالى دەكات ئەو دەڵێ نا كاكە عوزری بۆ بهێنەوە نەزانە و هیچ نازانێت، بەردەوام ئەم كێشانە هەر هەبوونە، ئەم هەبوونی عوزرە گومانێكە هەر سەردەم و بەرگێكی تێدا دەدوورن.بۆیە لەگەڵ مێژووی ئەم گومانە كۆمەڵێ زانای خەمخۆرو دەست پتەو بە قورئان و سوونتەوە وەڵامی ئەم گومانەیان داوەتەوە و بۆ خەڵكیان ڕوون كردۆتەوە.بۆیە بۆ ئەم مەبەستە شێخی ئەسیر علی بن خضیر الخضیر الله تعالى ئازادی بكات.هەستاوە باس كرنی مێژووی ئەم بابەتە و بە كۆكردنەوەی وتەی زانایانی نەجدی كە بەڕاستی ئەوان شارەزاتر بە مێژووی ئەم گومانە كە گوایە جەهل عوزرە لە شیركی گەورەدا.ئەم ڕیسالەی بەناوی (المتممة لكلام أئمة الدعوة في مسألة الجهل في الشرك الأكبر) كە تێیدا هەموو وتەی زانایانی سەر ڕاستی ئومەتی تەوحیدی تێیدا كۆكردۆتەوە.سوپاس بۆ الله تعالى منیش هەستام بەوەرگێڕانی ئەم بابەتە پێویست و گرنگە بۆ قوتابیانی عەقیدە و تەوحید. داواكرام لە الله تعالى ئەم كارەم لەپێناو ڕەزامەندی خۆی وەرگرێ وە بیكاتە هۆكار بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە گرینگ و وردە.**

**براتان : هاوكار كوردى**

**٢٠ ڕەمەزانى ساڵى : ١٤٤٠ كۆچى بەرامبەر ساڵى : ٢٠١٩ عيسايي**

**شوێن : كوردستانى باشور**

# زانینی چەند دەستەواژەیەکی گرنگ

یەکەم : الكفر في اللغة : الستر والتغطية[1]

واتە : لەزمانی عەرەبی واتە : داپۆشین و شاردنەوە

الكفر شرعا : ضد الايمان.فيكون قولا وعملا واعتقادا وتركا .

واتە : لە زاراوەی زانایان : دژی ئیمانە.جا لە وتە و کردەوە و بیروباوڕ و وازهێنان.

جۆرەکانی کوفر : دووجۆر کوفرمان هەیە :

یەکەم : کوفری گەورە ئیمان هەڵدەوەشێنێتەوە کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەکات و بۆ هەتا هەتایی دەیباتە جەهەنەمەوە وە هیچ شەفاعەتێك نایگرێتەوە ئەویش پێنج جۆرە:

١ – كفر التكذيب واتە : بەدرۆخستنەوە.
٢ – كفر الاباء والاستكبار واتە : خۆ بەگەورەزان.
٣ – كفر الشك واتە : گومان.
٤ – كفر الاعراض واتە : پشت تێکردن.
٥ – كفر النفاق واتە : دووڕوویی

دووهەم : کوفری بچوك ئیمان هەڵناوەشێنێتەوە تەنها لاوازی دەکات.وە خاوەنەکەی لە ئیسلام نایاتە دەرەوە.

ئەویش جۆری زۆرە.

دووهەم : الشرك في اللغة : قال ابن منظور الشرك يعني : المخالطة[2]

---

[1] بحر المحيط ج٢ ص٣٣٤

واته : لە زمانی عەرەبـی : شیرك واتە تێكەڵ بوون لـە شەریك واتە هاوبەش.

الشرك شرعا : قال الشيخ سليمان بن عبدالله ال الشيخ : تشبـيه للمخلوق بالخالق في خصائص الالهية.من ملك الضر والنفع .[3]

واته : لەزاراوەی زانایان : شێخ سلیمان دەفەرمووێت : چواندنی درووستكراوە بە درووستكار لـە تایبەت مەندی ئیلاهیەت.لـە زەرەر و سوود.

جۆرەكانی شیرك : دووجۆرمان هەیە :

یەكەم : شیركی گەورە ئەوەیە كە : عیبادەت بۆ غەیری الله تعالی ببیت..هتد

تەوحید دابەش دەبـیت بۆ سێ بەش ( الربوبـية والألوهية والأسماء والصفات ) جا شیركی گەورە بەسەر ئەم سێ جۆرە دابەش دەبـیت :

١ – الـشرك الأكبر فی الربوبـية : بە گەورەدانانی مردوو وەك ئەوەی پەیكەری بۆ درووست بكەیت وە بـیناكردن لـەسەر گۆڕەكان و ببـیتە جێگای عیبادەت.

٢ – الشرك في الألوهية : بڕوات وابـیت غەیری الله تعالی شایەنی پەرستن بـیت.یان ناو لـەكەسێك نێیت دەلالـەت لـە پەرستن بكات وەك (عبدالرسول ) و ( عبدالحسين ) هاوار و هانا و نەزر و قوربانی بۆ غەیری الله تعالی.

٣ – الـشرك فی الأسماء والـصفات : ئیشتقاقی ناوی خودایانێكی باتڵ بە ناوی الله تعالی بكرێت وةك (اللات من الالة) و (العزى من العزيز).

---

[2] لسان العرب ج : ٧ ص : ٩٩

[3] تيسير العزيز الحميد ص : ٩١

## سێهەم : من هم أهل الفترە ؟ : ئەهلی فەترە کێن ؟ :

١ – پێشەوا ئین کەسیر دەفەرموویێت[٤] : هي مابـين كل نبـيين كانقطاع الرسالة بـين عيسي عليه السلام ومحمد صلى الله عليه وسلم .

واتە : نێوان هەموو پێغەمبەرێك کە ڕیسالەی الله تعالی بچڕاوە لـەم نێوەدا کە نێوان پێغەمبەر عیسی و محمدە صلى الله عليه وسلم.

چوارەم : ئیقامە حوجە ( الاقامە الحجە ) واتە : گەیشتنی دەقی شەرعیە لـە قورئان یان لـە سوونەت بە واجب کردنی کارێك یان حەڕام کردنی بۆ کەسێکی باڵغی عاقڵ.

پێنجەم : كفر المعين واتە : کافرکردنی کەسێك بە دیاری کراوی بۆ نمونە بڵێیت : زەید کافرە

شەشەم : كفر المطلق واتە : کافرکردن بە ڕەهایی وەك بڵێیت : هەرکەسێ ئەو کارە بکات کافر دەبـیت.

پێش ئەوەی بچینە ناو ڕیسالەکە ئەم شتانەی سەرەوەم بە پێویست زانی باسی بکەم بۆ ئەوەی ئاسانتر لـە مەبەستی زانایان تێبگەیت.

چەند تێبـینەیەك :

یەکەم : هەموو دەقەکانی ڕیسالەکەم هێناوە بۆ ئەوەی کوردی و عەربـی بـیت بۆ دوو مەبەست  ١ – بتوانن دەقە عەرەبـیەکەشتان لابـیت.

٢ – فێرە عەرەبـیەکەش بن و جوان لـە وتەی ئەهلی علـم تێبگەن.

دووهەم : تەعلیقاتی شێخ علی لـەخوارەم داناوە وەك ڕیسالەکەی خۆی نزیکەی

---

)٤-تفسير القرآن العظيم ج : ٢ ص : ٣٥

(٧٠) تعليقات دەبـيت كە لـەسەر دەقەكانی ئەهلی ئیزافەی كردووە زۆر پێویستە هۆشیاری بـیت.وە لـەناو دەقەكانی زانایانیش لـە نێوان () بە شین نووسراوە ئەوەش قەسەی شێخ علی یە.

سێهەم : خۆشم لـەناو شەرحەكە زیاتر ڕوونكردۆتەوە بۆ ئەوەی ئاسان تێی بگەیتەی دەستەواژەكانی سەرەوە خۆم نووسیومن بۆ ئەوەی پێش ئەوەی بچیتە نێو ڕیسالـەكە ئەم شتانە پێویستە بزانیت.

## پێشەکی نوسەر

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبـياء والمرسلين نبـينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين أما بعد :

ئەمە تەواوی ئەو وتانەیە کە گەورە زانایانی دەعوەی سەلەفی نەجدی نووسیتیان لەبابەتی نەبوونی عوزری جەهل لە شیرکی گەورەدا کە کۆکراوەی ئەم کتێبانەیە کە لەسەر ئەم باسە شتیان نووسیووە ئەویش ئەو کتێبانەن :

یەکەم : مفيد المستفيد في كفر تارك التوحيد، للشيخ العلامة الإمام محمد بن عبد الوهاب رحمه الله.

دووهەم : رسالة الانتصار لحزب الله الموحدين والرد على المجادل عن المشركين، للشيخ عبد الله بن عبد الرحمن ابابطين رحمه الله.

سێهەم : رسالة تكفير المعين، للشيخ إسحاق بن عبد الرحمن آل الشيخ رحمه الله.

ئەو سێ کتێبەم تایبەت کرد بۆ ئەوەی ئەم باسانەی تێدا کۆبکەمەوە.وە چەندین وتەی ئەهلی علم خستۆتە سەری لەسەر ئەم بابەتە لەیەکەی ڕیسالەکە.کە هەموویان لە کتێبەکەم بەناوی (الجمع والتجريد فى شرح كتاب التوحيد ) لەوێ ئەم باسەم زیاتر باس کردووە گەر دەتانەوێت زیاتری لەسەر بزانن ئەوە بگەڕێنەوە بۆ ئەم کتێبە.

والله الهادي والموفق إلى سواء السبـيل ، وصلى الله على نبـينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

براتان: علي بن خضير الخضير

القصيم — بريدة

## بەشي يەكەم

## مێژووی ئەم گومانە :

ئەم گومانە پێش سەردەمی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە بەدیار کەوتووە لەبەر ئەوەی هەرکەسێ بانگەوازی ئەم گومانە دەکات کە عوزر لە شیرکی گەورە دا هەیە وتەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەکاتە بەڵگە لەسەر بوونی عوزر بە نەزانین ( عذر بالجهل ) لە پاشاندا ئەم گومانە لەسەردەمی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب سەری هەڵداوە لەسەر دوو جەمسەر .

یەکەم: خەڵکانێکی گومڕا بڵاویان دەکردەوە شێخ محمد لە کتێبـی (مفید المستفید فی حکم تارك التوحید) ڕەدی دەدانەوە.

دووەم: شاراوەتر بوو لەبەر ئەوەی خەڵکانێك ئەم گومانەیان دروست دەکرد و لە خەڵکیان تێکەڵ دەکرد خۆیان لەسەر حەق دەزانی و بە حیساب بانگخوازانی تەوحید و یەك خوا پەرستین.

نمونەی: هەندێك لە قوتابـیەکانی لە شاری درعیە و وە لە شاری (الاحساء) لە پاشان بە هۆی وەڵام و ڕەددانەوەکانی شێخ ئەم گومانە کەوتە ژێر گڵ و نەما لە پاشان دووبارە لە جیلی پاش شێخ محمد لە سەردەمی نەوەکەی شێخ ( عبدالرحمن کوڕی حسن ) سەری هەڵداوە ئەوکەسانەی هەستان بە بڵاوکردنەوە و نوێکردنەوەی ئەم گومانە داودی کوڕی جەرجیس و عوسمانی کوڕی منصور بوون. بەڵام لە لایەن شێخ عبدالرحمن کوڕی حسن . وەڵام درانەوە و دەم کوت کران . بەیارمەتی کوڕەکەی ( عبدالطیب بن عبدالرحمن بن حسن ) لە چەندین کتێبـی ناودار وە موفتی ئەوکاتی ( نجد ) شێخ ابا بطین النجدی کە ئەم گومانە کپ کرایەوە و نەما.

لە پاشان بۆ جارێکی تر لە جیلی سێهەم ئەم گومانە دووبارە بۆیەوە بەڵام ئەوکاتیش کوڕ و نەوەکانی شێخ لە چەندین کتێب و نامە وەڵامی ئەم گومانەیان دایەوە وەك: شێخ اسحاق بن عبدالرحمن و شێخ سلێمان بن سحمان بە کتێبی و فتاواکانی لە هەمان کاتدا بە یارمەتی کوڕانی شێخ عبداللطیف: عبدالله و ئیبراهیم وەڵامی ئەم گومانەیان داوەتەوە. بەردەوام ئەم گومانە لەهەموو سەردەمێك نوێ دەبێتەوە. لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەم گومانە وا بڵاوبۆتەوە و سەری هەڵداوەتەوە ( کە گوایە باسی (عذر بالجهل في الشرك الأكبر) عوزر بە نەزانین لە شیرکی گەورەدا جێگای خیلافی زانایانە. لە پاشاندا ئەم خیلافە دابەش دەکەن بەسەر دوو قەول ئەم گومانە بەم جۆرە لە هەندێك کتێبی زانایەکانی سەردەم و وە لە ڕیسالەکانی زانایان بڵاوە و بوونی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ سەیردەکەیت ئەم خیلافە پاڵ نەدراوەتە لای هیچ کەسێك بە شێوەیەکی نامۆ و نا تەندروست بڵاوە. بەڵکو بە شێوەیەکی ڕەها باس دەکرێت بڵاوبوونەوەی ئەم تێگەیشتنە لەسەر ئەم باسە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوگومانەی کە گوایە شێخ محمد بن عبدالوهاب دوو بۆچوونی هەیە لەسەر ( عذر بالجهل ) لە شیرکی گەورەدا ئەوەش لە کاتێکدایە کە هاتوونە سەیری هەندێك لە ووتەکانی شێخیان کردووە وا تێگەیشتوونە کە شێخ وتوویەتی کە ( عذر بالجهل ) لە شیرکی گەورەدا هەیە. بێگومان دیارە ئەو تێگەیشتنەش بینا کراوە لەسەر تێکەڵ کردن و تێگەیشتنی هەڵە لە ووتەکانی شێخ محمد لەسەر ئەم باسە بە ویستی الله تعالى لە داهاتوودا لە چەند باسێکدا وەڵامی ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە دەدەینەوە کە لەسەر ووتەکانی شێخ دروست بووە. وە ڕووی ڕاستی بۆچونی شێخ لەسەر ئەم باسە ڕوون دەکەینەوە.

پوختەی قسە: چیرۆکی هەبوونی ڕاجیایی و خیلاف لەسەر بابەتی ( عذر بالجهل ) لە شیرکی گەورەدا نوێ یە لەم سەردەمە کە پێشتر نەبووە. بەڵکو پێشتر تەنها دەیان

ووت: ئەوە اجتیهادە. باسی هەبوونی خیلافیان نەدەکرد ئەم باسە وەکو نمونەی باسی ئەوەیە کە: تەکفیر کردنی جەهمیەکان جێی خیلافە و دابەش بووە بەسەر دوو قەول. ئەم خیلافە دەگێڕنەوە بـی ئەوەی پاڵدرابـیت بۆلای هیچ کەسێك.

تەنها گومانێکی هەڵەیە و بـینا کراوە لـەسەر تێگەیشتنی هەڵە لـەسەر هەندێك لە ووتەکانی شێخی ئیسلام ابن تیمیە ( خاوەنی ئەم قسە وگومانە هیچ جیاوازی لە نێوان دەستەواژەکانی شێخ ئیبن تەیمیە لـەسەر ناو لێنانی جەهمیەکان نەکردووە لە کاتێکدا دەگۆڕێت بەپێی ڕستە)

ئەم گومانە: لـە سەردەمی شێخ سلیمان بن سحمان بلاو بۆیەوە و شێخیش لە کتێبەکانی ڕەد و وەلامی ئەم گومانەی دایەوە و فەرمووی: ئەم بابەتە تەکفیری جەهمیەکانە ( وفاقیة ) جێگیرە و نەگۆڕە وە هیچ خیلافێك لـە کافر کردنیاندا نیە. وەلامی ئەم گومانانە لـە هەردوو کتێبـی ( رفع الالـتباس و کشف الـشبهتین ) هەیە. بە ویستی اللە تعالی لـە شوێنی خۆی ووتەکانی شێخ لـەسەر ئەم باسە نەقل دەکەین وە هەروەها کوڕەکانی شێخ عبداللطیف ال شێخ: عبداللە و ابراهیم. وەلامی ئەم گومانەیان داوەتەوە وە دەفەرموون ( دوعا کردن لای گۆڕی پیاوچاکان وە هانا و هاوار بۆ کردنیان وە ببـیتە مەبەستیان لـە کاتی خۆشی و ناخۆشی بۆ هاوار کردن لێیان ئا ئەوە موسوڵمان هیچ گومانیان نیە لـە حەڕامی و وە حوکم دان لـەسەر ئەوەی کە شیرکی گەورەیە و موشریك دەبن. نە لـە کافر کردنی ئەو موشریکانە و کافر کردنی جەهمیەکان خیلاف نیە. وا گومان نەبەن کە خیلاف هەبـیت )

## بەشی دووهەم

(هل من وقع في الشرك الأكبر يُسمى مشركا بمجرد الفعل؟ هل من وقع في الشرك الأكبر يُسمى مشركا بمجرد الفعل والوقوع ويُخاف عليه من ذلك ولو كان جاهلا أو مقلدا أو متأولا أو مخطئا أم لا؟) واته : ئايا هەرکەسێك کەوتە ناو شیرکی گەورە پێی دەوترێت ( مشرك ) تەنها بەکردەوە و تێکەوتن تێیدا وە ترسیشی هەبێت لەسەری. ئەگەر هاتوو جاهل بێت یان لاسایی کردنەوەش بێت یان تأويل هەبێت یان بە هەڵە تێی کەوتبێت یان نا ؟

بینا دەکرێت لەسەر ئەوەی ( ئایا جەهل- نەزانین عوزە لە شیرکی گەورە دا ) یان عوزرنیە کە مەزهەبی سەلەف لەسەر ئەوەن کە دێتە پێشت بە ویستی الله تعالى وە باسەکانی ( تأويل و تقليد و خطا ) دەکەین ان شاء الله. ئەوە ڕامان دەکێشێ بۆ ناوەڕۆکی ئەم باسە گەورە و گرینگە کە لە گرینگترین بابەتەکانی فێربوونی تەوحید و تێگەیشتنە لە شیرك وە هەروەها لە گرینگترین باسەکانی جیاوازی کردن لە نێوان ناو و حوکمەکانە ( الاسماءْ و الاحكام ) وە نەبوونی جیاوازی لە نێوانیان. ئەوەش لەسەرمان پێویست دەکات کە باسی ئەم بابەتە بکەین لە خیلالی بەشەکان و وتە و تعليقات لەسەری. وە تێدا باسی ووتەی زانایان و ئەهلی علم بکەین لەسەر ئەم بابەتە. لە پاشاندا باسی لە وتەی شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب و قوتابی و کوڕ و نەوەکانی دەکەین هەر لەسەردەمی شێخەوە تاکو کۆتا نەوەکانی ئێستای ( ال شيخ ) باسی دەکەین. وە لە پێش ئەوانیش باس لە وتەی شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیە و قوتابیەکەی ئیبن قیم دەکەین وە نەقلی ( اجماع )ە کانیش دەکەین لەسەر ئەم بابەتە وە هەروەها باس لە قیاساتی درووست دەکەین لەسەر ئەم بابەتە بەویستی الله تعالى. ئێستاش دەچینە ناو ناوەڕۆکی بابەتەکە دەڵێین :

## بەشي سێهەم

## لە ووتەی ئەهلی علم لەسەر باسی جەهل :

یەکەم : لە صەحیح هاتووە کە ئیبن عباس لەبارەی گەلی نوحەوە دەفەرموویت (لم نُسى العلم عُبدت) واتە : کاتێك زانست لەبیرکرا پەرستڕا، کاتێ جەهل الله تعالی پەرستڕا ناویان لێنرا بەندەی غەیری الله تعالی لەگەڵ ئەوەشدا جەهلیان هەبوو.

دووهەم : باوکی یوسف لە ئیمامی ئەبو حەنیفە ڕیوایەت دەکات کە فەرموویەتی: عوزر بۆ هیچ کەسێك نیە لە دروستکراوەکان لەسەر نەزانین و لە بەرامبەر ناسیق دروستکراوەکەی کە ( الله ) یە. لەبەر ئەوەی واجبە لەسەر هەموو دروستکراوێك کە دروستکارەکەی خۆی بناسێت هیچ عوزرێك نیە لە ناسینی. وە نەناسینی تەنهایی و لە عیبادەت و پەرستش دا. کاتێ کە دروستکراوەکانی وەك ئاسمانەکان و زەوی و نەفسی خۆت و گشت دروستکراوەکانی دەبینێت ئەوە دەبێتە حوجە لەسەرت. بەڵام واجبەکانی الله تعالی نەیزانی وە پێی نەگەیشت ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەری وەك حوکم)

سێهەم : شێخ عبداللطیف ال شیخ دەفەرمووێ ( لە کتێبی (السنة) عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد هاتووە (باوکی سعیدی کوڕی یعقوب بۆی گێڕامەوە ئەویش موئمیلی کوڕی ئیسماعیل کە گوێی لە عمادەی کوڕی زازان بوو فەرموویەتی: پێمان گەیشتووە کە قەدەریەکان لە ڕۆژی قیامەتێ لەگەڵ موشریکان کۆدەکرێنەوە و حەشر دەکرێن قەدەریەکان دەڵێن: سوێند بە الله تعالی ئێمە لەگەڵ موشریکان نەبووین. پێیان دەوترێ: ئێوە شیرکتان دەکرد بەبێ ئەوەی بزانن. واتە (جاهل) بوون.

چوارەم : ئیمامی ئیبن جەریری تەبەڕی لە تەفسیرەکەی لەسەر شەرحی وتەی الله تعالی

﴿فريقا هدى وفريقا حق عليهم الضلالة إنهم اتخذوا الشياطين أولياء من دون الله ويحسبون أنهم مهتدون﴾ دەفەرمووێ: ئەو كرووپەی كە گومڕاییان لەسەر چەسپاوە ئەوانە گومڕابوون ەلە ڕێگای الله تعالى وە بەدوای شەیتانەكان كەوتن و سەریان خست و بوونە پشتیوانی بەڵام نەزان بوون بەوە بەهی هەڵەوە كە وا گومانیان برد لەسەر ڕێگای ڕاستن وە صەواب ئەوەیە كە لەسەرینە كە ئەوان لەسەری هاتوون و ڕۆیشتوون. ئەوە لە بە ڵگەكانە لەسەر ئەو قسە هەڵەیەی كە: وا گومان دەبەن الله تعالى كەس عەزاب نادات لەسەر تاوانێك كە كردوویانە یان بـیروباوەڕێكی گومڕایان هەبووە مەگەر پاش ئەوەی كە زانیان .....) ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جهل – نەزانین – عوزر نیە.

شەشەم : وە هەروەها شێخ ابا بطین لە ئیبن جەریر لەسەر تەفسیری ئایەتەكەی سورەی ئەعراف دەفەرمووێت (وهذا يدل على أن الجاهل غير معذور) واتە : ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە جاهیل هیچ عوزرێكی نیە.

حەوتەم : وە ( ابن كثير ) یش لەسەر قسەكەی ( ابن جرير ) موافقە و كۆكە.

هەشتەم : وە پێشەوا ( بغوی ) لە تەفسیری هەمان ئایەت دەفەرمووێت (فيه دليل على أن الكافر الذي يظن أنه في دينه على الحق والجاحد والمعاند سواء) واتە : ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە كافر وا گومان دەبات لەسەر دینێكی ڕاستە. كەسی نكۆڵكار و ئینكار یەكسانن.

نۆیەم : پێشەوا بوخاری لە صەحیحەكەیدا لە " كتاب الايمان " لە " باب المعاصی من أمر الجاهلیه "دەفەرمووێت (ولا يكفر صاحبها بارتكابها إلا بالشرك لقول النبـي صلى الله عليه وسلم" "إنك امرؤ فيك جاهلية"، وقال الله عز وجل: (إن الله لا يغفر أن يشرك

به ويغفر مادون ذلك لمن يشاء) ) واته : خاوەنی هیچ گوناهێك كافر ناكرێت ئیلا ( شرك ) نەبـیت .

دەیەم : ئیبن منده لـه كتێبـی " التوحيد " ج : ١ ص : ٣١٤ لـه " باب ذكر الدليل على أن المجتهد المخطئ في معرفة الله عز وجل ووحدانيته كالمعاند" لـەسەر تەفسیری ئەم ئایەتە ﴿هل ننبئكم بالأخسرين أعمالا الذين ضل سعيهم في الحياة الدنيا وهم يحسبون أنهم يحسنون صنعا﴾ ئەسەرێكی ئیمام عەلی نەقل دەكات كاتێ كە پرسیاریان دەربارەی ئەو كەسانەی كە كردەوەكانیان بە زایا چوو ( الاخسرين أعملا ) فەرمووی: كوفری ئەهلی كتاب سەرەتاكانیان لـەسەر حەق و ڕاستی بوون دواتر شیركیان بۆ الله تعالى بڕیاردا وە زیادەیان خستە ناو دینەوە وە خراپەیان لـەگەڵ نەفسی خۆیان كرد و لـەسەر گومڕایی كۆبوونەوە وە وایان حیساب دەكرد و گومانیان دەبرد كە لـەسەر هیدایەت و ڕاستین. وە ئیعتیمادیان كرد لـەسەر باتڵ وە وا گومانیان كرد كە لـەسەر حەق و ڕاستین ئا بەڕاستی ئەوانە ئەو كەسانەن كە هەوڵ و كۆششیان لە ژیانی دونیادا بە زایە و بە هەدەرچوو بە مەرجێك وایان دەزانی كە بەڕاستی كاری چاك دەكەن و كردەوەی ڕەوا ئەنجام دەدەن.لە پاشان باس لـەو ئەسەرەی سەلمانی فارسی دەكات: كاتێ سەلمان باسی حاڵی گاورەكانی پێش نێردراوێتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلـم بۆ پێغەمبەری كرد كە ڕۆژوویان دەگرت و نوێژیشیان دەكرد وە شایەتی ئەوەشیان دەدا كە تۆ نێردراوی خوای بۆ جیهان ڕەوانە دەكرێت پاشـــان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلـم فەرمووی: ئەوانە ئەهلی ئاگرن.

یازدەهەم : ئیمامی بەربەهاری لە كتێبـی " شرح السنه " ج : ١ ص : ٤٩ دەفەرموێت (ولا يخرج أحد من أهل القبلة من الإسلام حتى يرد آية من كتاب الله عز وجل أو يرد شيئا من آثار رسول الله صلى الله عليه وسلم أو يذبح لغير الله أو يصلى

لغير الله، وإذا فعل شيئا من ذلك فقد وجب عليك أن تخرجه من الإسلام، وإذا لم يفعل شيئا من ذلك فهو مؤمن مسلم بالاسم لا بالحقيقة) واته : هیچ کەسێك لە ئەهلی قیبلە دەرناچێت لە ئیسلام تاوەکو ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز ڕەت بکاتەوە یان شتێك لە شوێنەواری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕەت بکاتەوە یان قوربانی بۆ جگە لە الله تعالی بکات یان نوێژی بۆ جگە لە الله تعالی بکات هەریەکێك لە مانەی ئەنجامدا ئەوکات لەسەرت واجب دەبێت کە دەری بکەیت لە ئیسلام بەڵام ئەگەر هیچ کام لەمانەی ئەنجام نەدا ئەوە ئیمانداری موسوڵمان بە ناو نەوەك بە حەقیقەت نەقلی ووتەیەکی ئیبن عومەر دەکات کە دەفەرموێت (لاعذر لأحد في ضلالة ركبها حسبها هدى، ولا في هدى تركه حسبه ضلالة، فقد بينت الأمور وثبتت الحجة وانقطع العذر) واته : عوزر بۆ هیچ کەسێك نیە کە لە ناو گومڕایی بژێت وە واش بزانێت کە لەسەر حەق و ڕاستیە وە لەسەر هیدایەت بیت وازی لێبینێت لەبەر ئەوەی کەوا گومان دەبات لەسەر گومڕایە کارەکە ڕوونە و بەڵگەش چەسپاوە و عوزریش کۆتایی پێهات.

دوازدەهەم : ئیمامی اللالكائی لە کتێبی "شرح أصول اعتقاد أهل السنه" ج:٣ ص:٥٢٨ لە (باب" سياق ما روى فى تكفير المشبهه)دەفەرموێت (تكلم داود الجواربي في التشبيه فاجتمع فيها أهل واسط منهم محمد بن يزيد وخالد الطحان وهشيم وغيرهم فأتوا الأمير وأخبروه بمقالته فأجمعوا على سفك دمه) واته : داود جواربی قسەی لەسەر ( تەشبیه ) دەکرد ئەهلی واسط وەك: محمد بن يزيد و خالد الطحان و هشيم غەیری ئەوانیش کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی کە خوێنی بڕژێردرێت. نعیم کوڕی حماد دەفەرموێت (من شبه الله بشيء من خلقه فقد كفر، ومن أنكر ما وصف الله به نفسه فقد كفر) واته : هەرکەسێك الله تعالی بە مخلوقات بچوێنێت ئەوە کوفری کردووە. وە هەرکەسێك ئینکاری سیفەتێکی الله تعالی بکات کە وەسفی خۆی

پێ کردووه ئەوه کوفری کردووه.

وه پێشەوا ئیسحاقی کوڕی ڕاهویه دەفەرموویت (من وصف الله فشبه صفاته بصفات أحد من خلق الله فهو كافر بالله العظيم) واته : هەرکەسێ سیفاتێکی الله تعالى بچوێنێت به سیفاتێکی مخلوق ئەوه کافر بووه به الله تعالى.

(ومن عبد غير الله فقد شبه الله بخلقه فجعل بعض خلق الله إله يعبد) واته : هەرکەسێ شتێك غەیری الله تعالى بپەرستێت ئەو چواندوویەتی به مخلوق. چوونکه هەندێك مخلوق بۆته ئیلاه دەپەرسترێت .

سێزدەهەم : پێشەوا تەبەری لـه تەفسیرەکەی ج: ٧ ص:٣١٩ دەفەرموویت(ولا عذر للمقلد في التوحيد) واته : هیچ عوزرێك بۆ لاسایی کەرەوه نیه لـه یەك خوا پەرستی و تەوحید

چواردەهەم : قاضي عياض لـه کتێبــی (الشفاء) لـه کۆتایی فەصڵەکه لەژێر ناونیشانی "بــيان ما هو من المقالات كفر وما يتوقف أو يختلف فيه وما ليس بكفر "یەکەم شت که دەفەرموویت (كل مقالة صرحت بنفي الربوبــية أو الوحدانية أو عبادة أحد غير الله أو مع الله" فهي كفر) ، واته : هەر قسەیەك به صەریحی نەفی لـه پەروەردگاریەتی یان تاك و تەنهایی یان عیبادەت . دەفەرموویت: هەڵه و غەڵەت نابــیته ڕێگر لـه ناسینی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی وەك . جێگیرکردنی کردنی یەکێك جگه لـه الله تعالى یان هاوبەشی بکەیت لـه عیبادەتی ئەوه کافره.

چواردەهەم : ابن عقيل دەفەرموویت(من دعا صاحب التربة ودس الرقاع على القبور" أنه شرك أكبر، وقد نقل أئمة الدعوة عنه هذا كثيرا على وجه الإقرار له) واته : هەرکەسێك هاواری خاوەنی گۆڕێك بکات یان پەڕۆ بەسەر قەبردا هەڵواسێ بۆ

تەبەڕووك ئەوە شیركی گەورەی كردووە. وتەی زانایانی دەعوەی تەوحید زۆرە لەو بارەیەوە.

پازدەهەم : ئیمامی شەوكانی لە " ارشاد الفحول " لە " باب الاجتهاد " دەفەرموویت (ما يكون الغلط فيه مانعا من معرفة الله ورسوله، كما في إثبات العلم بالصانع والتوحيد والعدل، قالوا" فهذه الحق فيها واحد، فمن أصابه أصاب الحق، ومن أخطأه فهو كافر) واته : غەلەت نابیتە ڕێگر بۆ ناسینی الله تعالی و پێغەمبەرەكەی وەك چەسپاندنی زانست بە دروستكراوەكانی وە بە تەوحید و دادپەروەری دەڵێت: ئەمە حەق و ڕاستیە جا هەركەسێ پێكای ئەوە ڕاستی پێكاوە وە هەركەسێ هەڵەی تێدا كرد ئەوە كافر بووە.وە دەفەرموویت (ليس مجرد قول لا اله إلا الله من دون عمل بمعناها مثبتا للإسلام، فإنه لو قالها أحد من أهل الجاهلية وعكف على صنمه يعبده لم يكن ذلك إسلاما) واته : تەنها وتنی لاالەالاالله بەبێ كردەوە بە واتاكەی جێگیر بكەیت بۆ ئیسلام. ئەگەر هاتوو یەكێك لە ئەهلی جاهلی ئەوە بلێت وە ئیعتیكاف بكات لەسەر بتێك و بپەرستێ ئەوە پێی ناوترێ تەسلیم بووە و ئیسلام بووە

شازدەهەم : ابن فرصون لە "تبصره الحكام" لە"باب الرده"، دەفەرموویت (مسألة ومن عبد شمسا أو قمرا أو حجرا أو غير ذلك فانه يقتل ولا يستتاب)واته :باسێك هەیە هەركەسێ پەرستشی ڕۆژ بكات یان مانگ یان بەردێك یان جگە لەوانە ئەوە دەكوژرێت و داوای تۆبەی لێناكرێت.

## بەشي چوارەم

## وتانێكی ڕوون لە وتەكانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب لەبابەتی (عذر باالجهل في الشرك الأكبر)

تێبـینی : بەویستی الله تعالی تەعلیق دەنووسین لەسەر ئەو وشانەی كە پێویستیان بە ڕوونكردنەوە دەبـێت.لە خوارەوەی پەڕەكە.

یەكەم : پێش باس كردنی وتەی شێخ لەسەر ئەم بابەتە پێم خۆشە شتێك ڕوون بكەمەوە ئەویش ئەوەیە كە شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب -بەڕەحمەت بـێت- كتێبـێكی سەربەخۆی هەیە لەم بابەتە ئەویش كتێبـی (مفید المستفید فی كفر تارك التوحید) ناونیشانێكی هەیە لەم كتێبە لەسەر تەكفیركردنی ئەو كەسەی واز لەتەوحید یان تەركی دەكات كە پێویست دەكات بكەرەكەی بخاتە نێو شیركەوە.ناونیشانەكەشی ئەوەیە (تكفیر المعین اذا أشرك) وەتێیدا بەتوندی هێرش دەكاتە سەر ئەو كەسانەی كە دەڵێن : شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە كەسیی ( معین )ی كافر نەكردووە لە بابـی (شرك)دا.

دووەهەم : وە هەروەها كتێبـی (كشف الـشبهات) لەهەندێك شوێندا بە ڕاستەوخۆ و صەریحی باس لەوە دەكات كە (عذرباالجهل) لە ( الـشرك الأكبر)دا نیە.

سێهەم : هەروەها شێخ محمد لە ڕیسالەی ( نواقض الاسلام العشر ) دە هەڵوەشێنەرەوەكەی ئیسلام.هیچ عوزرێك بۆ كەسی جاهیل ناهێنێتەوە.یەكێك لە دە هەڵوەشێنراوەكان ئەوەیە كە : ئەوكەسانەی كە گاڵتە بەدین دەكات یان جوێن ئەوە بەگاڵتە و نا گاڵتە یەك حوكمیان هەیە مەگەر كەسێك ( مكره ) زۆرلێكراوبـێت.هیچ شتێكی لێ جیانەكردۆتەوە نە ( تأویل نە جەهل نە هەڵە )بگەڕێوە بۆ ( فتاوی الأئمة

النجدية ج : ٣ ص : ١٨٨).

چوارەم : وە هەروەها لـە كتێبـی ( الدرر السنية في الأجوبة النجدية ج :٨ ص :١١٨) كاتێ باسی هەڵگەڕاوەكان و جۆرەكانیان دەكات تێیدا هاتووە كە دەفەرموێت : هەركەسێ پێغەمبەر محمد صلى الله عليەوسلـم بەدرۆی بزانێت وە بگەڕێتەوە بۆ پەرستنی بتەكان وە ئەو كەسەی دان بە پێغەمبەرایەتی (مسيلمة الكذاب) و هاوشێوەكانی دادەنێت و هاوبەشی دەكات لـەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلـم لـە پێغەمبەرایەتی لـەگەڵ ئەوەشدا (أجمع العلماء أنهم مرتدون ولو جهلوا ذالك ومن شك في ردتهم فهو كافر) زانایان كۆكن لـەسەر هەڵگەڕانەوەی ئەوانە ئەگەر نەزانیش بن پێی وە ئەو كەسەی گومانی هەبـێت لـەكافركردنی ئەوانە ئەوە خۆی كافر دەبـێتەوە.

پێنجەم : وە هەروەها شێخ لـە ( الدرر السنية في الأجوبة النجدية ج :٩ ص :٤٠٥ و ٤٠٦) دةفةرموويَت (لما نقل كلام ابن تيمية في التكفير: (وكلام ابن تيمية[٥] في كل موضع وقفنا عليه من كلامه لا يذكر عدم تكفير المعين إلا ويصله بما يزيل الأشكال" أن المراد بالتوقف عن تكفيره[٦] قبل أن تبلغه الحجة، وأما إذا بلغته الحجة حكم عليه بما تقتضيه تلك المسألة من تكفير أو تفسيق أو معصية، وصرح ابن تيمية رضي الله أيضا أن كلامه في غير المسائل الظاهرة، فقال في الرد على المتكلمين لما ذكر أن بعض أئمتهم توجد منه الردة عن الإسلام كثيرا، قال" وهذا إن كان في المقالات الخفية فقد يقال أنه فيها مخطئ ضال لم تقم عليه الحجة التي يكفر تاركها، ولكن هذا يصدر عنهم في أمور

---

[٥]- ئەوەش بەڵگەیە لـەسەر ئەوەی كە شێخ محمد تەواو شارەزای عقیدە و مەزهەب و مەنهەجی شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیە.

[٦]- تێبـینی بكە نەفی ناوی كوفری كردووە ( اسم الكفر ) نەوەك ناوی شیرك ( اسم الـشرك ) كە كافری ناكات واتای ئەوە نیە دەبـێتە موسڵمان نا بەڵكو موشریكە بەس كافر نیە.

يعلم الخاصة والعامة[7]من المسلمين أن رسول الله صلى الله عليه وسلم بعث بها وكفر من خالفها، مثل عبادة الله وحده لا شريك له ونهيه عن عبادة أحد سواه من الملائكة والنبــيين وغيرهم، فإن هذا أظهر شعائر الإسلام، ومثل إيجابه للصلوات الخمس وتعظيم شأنها، ومثل تحريم الفواحش والزنا والخمر والميسر، ثم تجد كثيرا من رؤسهم وقعوا فيها فكانوا مرتدين)، ثم ذكر مسألة تكفير المعين بعد بلوغ الحجة وقال: (لا نعلم عن واحد من العلماء خلافا في هذه المسألة) واته : كاتێ کە وتەی ئیبن تەیمیە نەقڵ دەکات لەبابەتی تەکفیردا : وتەی ئیبن تەیمیە لە هەموو شوێنێکدا لەسەری وەستاوین کە یەکێك لە وتەکانی گوایە تەکفیرکردنی کەسی ( معین )ی نەکردووە لەم بابەتە.

بۆیە کاتێ گەیشتینە سەری ئەم ئیشکال و کێشەی کە هەیە لاییەین بۆ ئەوەی ڕووی ڕاستی بابەتەکە ڕوون ببــیتەوە.مەبەست لە وتەی (توقف تكفير المعين) وەستانی ئیبن تەیمیە لەسەرکافرکردنی کەسی ( معین ) لە شیرکی گەورەدا پێش گەیشتنی بەڵگە بووە بەڵام کاتێ کە بەڵگەی پێی گەیشت ئەوە تەکفیر و تەفسیق و تەبدیعی کرد لەم بابەتە.وە ئیبن تەیمیە زۆر بە صەریحی لە وتەکانی لە جگە بابەتی ڕووکەش لە وەڵامی ( متكلمين ) باسی ئەوە دەکات کە زۆرێك لە گەورەکانیان تووشی هەڵگەڕانەوە بوونە لە ئیسلام وە دەفەرموویت : وە ئەگەر لە وتانێکی شاراوە بن ئەوە پێی دەوترێت : هەڵەکارێکی گومڕا ئیقامە حوجەی لەسەر نەکراوە تاکو بە تەرکی پێی کافر بکەین.بەڵام لە شتانێکدا دەبــیت کە گشتی و تایبەتی دەیزانن لە موسڵمانان.کە ئەوەی پێغەمبەر بۆی ڕەوان کراوە و وە کافرکردنی ئەوانەی پێچەوانەی دەوەستانەوە.وەك : پەرستنی الله تعالى بە تاك و بــی هاوبەش پەیداکردن بۆی.وە دوورکەوتنەوە لە پەرستشی جگە لەو وەك : فریشتەکان و پێغەمبەران و جگە

---

[7] ئەوە بنەماکانی زاهیرەن هەندێ جار پێی دەڵێن (المعلوم من الـدين بالضرورة )

لەوانیش.وە ئەگەر هاتوو شیعارەکانی ئیسلام ئاشکرا بکەیت وەك : بەجێهێنانی پێنج نوێژە فەڕزەکان و بە گەورەدانانی و وە وەك : حەڕام کردنی فەساد و داوێن پیسی و مەشرِوب و قومار.لەپاشان زۆرێك لە گەورەکان کەوتنە ناو ئەم شیرکە ئ ئەوە هەڵگەڕاوەن.لە پاشان باسی بابەتی تەکفیری ( معین )دەکات لەپاش ئیقامە حوجە دەفەرمووێت (لا نعلم عن واحد من العلماء خلافا في هذه المسألة) واتە : نازانم و نەم زانیوە لە هیچ زانایەك خیلافی هەبـیت لەم بابەتە.

شەشەم : ڕیسالە و دەقەکانی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب –بەڕەحمەت بـیت– بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە شێخ جەهل بە عوزر نازانێت لە شیرکی گەورەدا.وە ناوی لەو کەسە ناوە موشریك کە کردەوەی شیرك دەکات وە لەڕیزی موشریکان دایدەنێت.

مەبەست لە وشەی (کفر)هەندێك جار لای شێخ بەواتای ( شرك)ە.ئەگەرهاتوو ئیقامە حوجەی لەسەر نەکرابـیت.بەڵام ئەوکەسەی ئیقامە حوجەی لەسەرکراوە ئەوە پێی دەڵێت و ناوی دەبات بە (موشریکی کافر)بەڕاستی سەیرم دێ لەوەی ئەویش جیاوازی کردنە لە نێوان ناوی ئەو کەسەی شیرکی کردووە لە پێش ئیقامە حوجە و دوای ئیقامە حوجە.بەڵام ئەوە ڕاستیە و حەقە وە مەزهەبـی ئەهلی سونەی لەسەرە.هەروەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە نەقڵی دەکات. بگەڕێوە بۆ " مجموع الفتاوی ج :٢٠ ص: ٣٧ و ٣٨ " لەم دوو لاپەڕە وتانێکی تێدایە وەك دوڕ و گەوهەرن حەق وایە بە ئاوی زێڕ بنوسرێتەوە ئەویش ئەوەیە کەدەڵێت : ئا ئەمە ئەم ڕێگایەیە کە ئیبن قەیم و زانایانی دەعوە لەسەری بوون.وە هەموویان ئیجماع لەم بابەتە نەقڵ دەکەن.کە بە ویستی الله لە داهاتوودا دێتە پێشمان.وە ئێستا دەگەڕێینەوە

بۆ دەقەکانی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب-بەڕەحمەت بـیت- لـەسەر ئەم بابەتە لـە ڕیسالـەکانی :

" النص الأول " دەقی یەکەم : شێخ محمد لـە کتێبـی (کشف الـشبهات)لاپەڕە: ٩ دەفەرمووێت (فإنك إذا عرفت أن الإنسان يكفر بكلمة يخرجها من لسانه، وقد يقولها وهو جاهل، فلا يعذر بالجهل) واتە : تۆ ئەوەت زانی کە ئینسان کافر دەبـیت بە وشەیەك کە لـە زوبانی دەردەچێت.کاتێ ئەم وشەیە دەڵێت نەزانە پێی.ئا ئەو کەسە جەهل بۆی عوزر نیە.

دەبـینین جەهل نەبووە هۆی ئەوەی کە تەکفیر نەکرێت.

" النص الثاني " دەقی دووهەم : لـە ڕیسالـەیەك کە ڕد بوو بۆ ئیبن صباح کە لـە کتێبـی (تاريخ نجد)بە تەحقیقی ناصرالـدینی الاسد لاپەڕە : ٤٦٨ کە وەڵامی تۆمەتێك بوو کە بە شێخ محمدیان هەڵبەستبوو کە تێیدا هاتبوو (الحمد لله رب العالمين، أما بعد: فما ذكره المشركون على أني أنهى عن الصلاة على النبـي، أو أني أقول: لو أن لي أمرا، هدمت قبة النبـي صلى الله عليه وسلم، أو أني أتكلم في الصالحين، أو أنهى عن محبتهم، فكل هذا كذب وبهتان، افتراه علي الشياطين، الذين يريدون أن يأكلوا أموال الناس بالباطل، مثل أولاد شمسان، وأولاد إدريس، الذين يأمرون الناس ينذرون لهم، وينخونهم، ويندبونهم، وكذلك فقراء الشيطان الذين ينتسبون إلى الشيخ عبد القادر رحمه الله، وهو منهم بريء، كبراءة علي بن أبـي طالب من الرافضة فلما رأوني: آمر الناس بما أمرهم به نبـيهم صلى الله عليه وسلم أن لا يعبدوا إلا الله، وأن من دعا عبد القادر، فهو كافر" وعبد القادر منه بريء، وكذلك من نخا الصالحين، أو الأنبـياء، أو ندبهم، أو سجد لهم، أو نذر لهم، أو قصدهم بشيء من أنواع العبادة التي هي حق الله على العبـيد، وكل إنسان، يعرف أمر الله ورسوله لا ينكر هذا الأمر، بل يقر به،

ویعرفه) واته : سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان لە پاشاندا : هەندێك لە موشریکان (تێبـینی بکە و سەیرکە پێیان دەڵێت موشریك)باسی ئەوەیان کردووە کە من نەهیم کردووە لە صەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وە گوایە من گوتوومە : ئەگەر فەرمانێکم لەدەست بوایە ئەوە قوبەی پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم دەڕووخاند یان من قسەم کردووە لەسەر پیاوچاکان یان ڕێگری نەهیم کردووە لە خۆش ویستنیان.هەموو ئەو شتانە کە ئەوان دەیلێن درۆ و بوختانە بەسەر منیان کردووە.ئەو شەیتانانە دەیانەوێت ماڵی خەڵك بە باتڵ بخۆن وەك : منداڵەکانی شەمسان و منداڵەکانی ئیدریس کە فەرمانیان دەکرد بە خەڵك نەزریان بۆ بکەن و خیانەتیان لێبکەن و هاواریان بکەن.ئەوانە شەیتانە هەژارەکانن کە دەیان دانە پاڵ شێخ عبدالقادر گەیلانی وە لەوان بـیت.شێخ بەریە وەك بەرائەتی ئیمامی علی کوڕی ئەبو تالیب لە ڕافیزەکان.من تەنها فەرمان بەوە دەکەم بە خەڵك کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردووە کە : هیچ ئیلاهەك نەپەرستن جگە لە الله تعالی وە ئەو کەسەی هاوار و داوا بکات لە شێخ عبدالقادر ئەوە کافرە وە شێخیش لەوی بەریە بەهەمان شێوە هاواری پیاوچاکان و یان پێغەمبەران هاواری بۆ بکەن ین سەجدەی بۆ ببەن یان نەزری بۆ بکەن یان هەر عیبادەتێك لە جۆرەکانی عیبادەت بۆ ئەنجام بدەن کە مافی الله تعالی یە.بەسەر بەندەکانی هەر ئینسانێك الله تعالی و پێغەمبەرەکەی بناسێت نکۆڵی لەم کارە ناکات بەڵکو دانی پێدا دەنێت و دەیناسێت.

شاهێد لەم قسەیە (وأن من دعا عبد القادر، فهو کافر) ئەوە دەقەی شێخە لەسەر ئەوەی هەرکەسێ هاواری شێخ عبدالقادر و هاوشێوەی ئەوبکات کافرە ( تێبـینی بکە فەرمووی : هەرکەسێ پەرستنی شێخ عبدالقادر بکات و کردەوەی شیرك بکات ئەوە ناو لێناوە موشریکی کافر)

لە پاشاندا لـە کۆتایی ئەم ڕیسالـە فەرموویەتی (فإذا كان من اعتقد في عيسى بن مريم، مع أنه نبـي من الأنبـياء، وندبه ونخاه فقد كفر، فكيف بمن يعتقدون في الشياطين، كالكلب: أبـي حديدة، وعثمان، الذي في الوادي، والكلاب الأخر في الخرج، وغيرهم في سائر البلدان، الذين يأكلون أموال الناس بالباطل، ويصدون عن سبـيل الله) واته : هەرکەسێ بڕوای وابـیت کە عیسی کوڕی مەریەم لـەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرێکە لـە پێغەمبەرانی الله تعالى هاواری دەکرێت و هانای بۆ دەبردرێت ئەوە کوفری کردووە چ جای ئەوەی بڕوات بەو شەیتانانە وابـیت وەك سەگ : ئەبـی حەدیدە و عوسمان کە لـە دۆڵەکەدا بوون وە سەگەکانی تر لە خاریجی دۆڵەکە وە جگە لـەوانیش لـە گشت شارەکان کە ماڵی خەڵکیان بە باتڵ دەخوارد و ڕێگلریان لـە تەوحید و ڕێگای الله تعالى دەگرت.

شاهێد تێیدا: (من اعتقد في عيسى بن مريم، مع أنه نبـي من الأنبـياء، وندبه ونخاه فقد كفر)

لـە پاشاندا لـە کۆتایدا دەربارەی بـیروباوڕ بە پیاوچاکان دەفەرموویت (..بل هو عبادة الاصنام من فعله كفر..) واتە : بەڵکو ئەوە پەرستنی بتە هەرکەسێ تێی کەوێت ئەوە کارێکی کوفری کردووە (حوکمەکەی بەستۆتەوە بە کردەوە.کردەوەش ئەوەیە کە دەیکات ئەویش پەرستنی بتەکانە.لـە شەریعەتیشدا هەرگیز بە بەندەی بتەکان یان گۆڕ پەرستەکان ناوترێت موسڵمان ئەگەر جاهیل و نەزانیش بن پێی )

" النص الثالث " دەقی سێهەم : هەروەها هەر لـە کتێبـی ( تاريخ نجد ) لاپەڕە : ٤٧٤ چەند وەرەقەیەك هەن کە وەك وەڵامێك بۆ ئیبن سحیم ناردی بۆی کە تێیدا فەرمووی (فإذا كفّرنا من قال: إن عبد القادر، والأولياء، ينفعون ويضرون، قال: كفّرتم أهل الإسلام، وإذا كفّرنا من يدعو شمسان، وتاجا، وحطابا، قال: كفرتم أهل الإسلام) واته :

ئەگەر کافرمان کرد ئەو کەسەی کە بلێت : عبدالقادر و پیاوچاکان سوود و زەرەر دەگەیەنن ئەوە ئەهلی ئیسلام کافری کردووە وە ئەگەر کافرمان کرد ئەو کەسەی داوا دەکات لە شەمسان یان تاج یان ختاب دەڵێن : ئەهلی ئیسلام کافری کردووە.

شاهێد تێیدا : شێخ ئەو کەسە کافر دەکات کە عبدالقادر دەپەرستێ و هاواری دەکات.وە ئەو کەسەش کافر دەکات کە داوا لە شەمسان و تاج و ختاب دەکات کە ئەم کەسانە چەند صۆفیەکی سەردەمی شێخ بوو لە دەروەی عیینە دەژیان.

" النص الرابع " دەقی چوارەم : ئەویش ڕیسالەیەکە کە بۆ محمدی کوڕی عبد ناردی کە یەکێك بوو لە زاناکانی – ثرمد –کە ئەم ڕیسالەش لە کتێبی ( تاريخ نجد )هاتووە لە لاپەڕە :٢٦٣ پاش چەند وتەیەك دەفەرموویێت (ولكن أقطع أن كفر من عبد قبة أبي طالب لايبلغ عشر كفر المويس وأمثاله..) واتە : بەڵام بڕاوەتەوە کافر دەبیت ئەوکەسەی قوبەی ئەبی تالیب بپەرستێت ناگات بە چارەگێکی مویس و هاوشێوەکانی.

شاهێد تێیدا : بڕاوتەوە کافربوونی ئەو کەسەی کە گۆڕ دەپەرستێت وە هیچ عوزرێکی بۆ نیە.

" النص الخامس " دەقی پێنجەم : ئەویش ڕیسالەیەکە کە ناردوویەتی بۆ شێخ عبدالله کوڕی عیسی کە قازی شاری " الدرعية "بوو.ئەو ڕیسالەش کە چواردەمین ڕیسالەیە لە کتێبی ( تاريخ نجد )لە لاپەڕە : ٣٢٤ کە تێیدا ڕەخنەی لێدەگرێت کە چۆن گومانی لە کافرکردنی ئەو تاغوتانە هەیە.کە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب – بەڕەحمەت بیت–(فقد ذكر لي أحمد أنه مشكل عليكم الفتيا بكفر هؤلاء الطواغيت مثل : أولاد شمسان وأولاد ادريس.والذين يعبدونهم مثل طالب وأمثاله..) واتە : ئەحمد بۆ باس کردم کە ئێوە کێشەتان تێ کەوتووە لە فتواداان لەسەر کافرکردنی ئەم

تاغوتانە نمونەی : منداڵەکانی شەمسان و منداڵەکانی ئیدریس وە ئەوانەشی کە دەپەرسترێن نمونەی گۆڕی ئەبی تالیب و هاوشێوەکانی.

لێرە بۆمان ڕوون دەبیتەوە کە ئەمە دەقە لەسەرکافرکردنی ئەوەی تاغوتان دەپەرستێت.بەڵکو نکۆڵی لەو کەسەش دەکات کە ئەم تاغوتانە کافر ناکات.یان ئەو کەسانەی کە تاغوت دەپەرستێت ( تێبینی بکە ناوی لەوانە ناوە تاغوت وە ناوی لە تالیب و هاوشێوەکانی ناوە تاغوت وە ناگونجێت ئەو کەسەی تاغوت دەپەرستێت پێی بگوترێت : موسڵمان ئەگەر نەزان و جاهیلیش بیت پێی وە بۆی عوزرنیە.چوونکە ناوی شیرك بە کەسێ دەنووسێت و لەدەوری دەسوڕێتەوە کە ئەم شیرکە بە ڕاست بزانێت)

" النص السادس " دەقی شەشەم : ئەویش ڕیسالەیەکە کە بۆ عبدالرحمن کوڕی ڕەبیعەی ناردووە کە ئەو یەکێکە لە زانایانی – ثادق – ئەویش ڕیسالەی بیستەمە لە کتێبی (تاريخ نجد) هاتووە لە لاپەڕە : ٣٤١ پاش چەند وتەیەك شێخ محمد فەرموویەتی (فمن عبد الله ليلا ونهارا، ثم دعا نبيا، أو وليا عند قبره، فقد اتخذ إلهين اثنين، ولم يشهد أن لا إله إلا الله، لأن الإله هو المدعو، كما يفعل المشركون اليوم عند قبر الزبير، أو عبد القادر، أو غيرهما، وكما يفعل قبل هذا عند قبر زيد وغيره) واتە : هەرکەسێ شەو و ڕۆژ الله تعالى بپەرستێ.لەپاشان هاواری لە پێغەمبەرێك کرد یان چووە سەر گۆڕێك و هاواری پیاوچاکێکی کر د.ئەوە بەڕاستی بۆتە شوێنکەوتەی دوو پەرستراو.شایەتی تەوحید و وشەی لا الە الا الله ی ناداوە.لەبەر ئەوەی ئیلاه داوالێکراوە.وەك موشریکانی ئیمڕۆی لای گۆڕی زوبیر یان عبدالقادر یان جگە لەوان وە هەروەها وەك پێش ئیمڕۆ لای گۆڕی زید غەیری ئەویش دەمانەوە و هاواریان دەکردن.

شاهێد تێیدا : ناوی موشریکیان لێنرا ئەوانی گۆڕپیان دەپەرست و هاوەڵانی گۆڕپەرستن کە باسکراون وە هەروەها بوونەتە شوێنکەوتەی دوو پەرستراو.

" النص السابع " دەقی حەوتەم : ئەویش یەکێکە لە ڕیسالەکانی شێخ محمد کە بۆ شێخ سليمان کوڕی سحيم کە قازی شاری ڕیاز بوو.ئەوەش ڕیسالەی نۆیەمە لە کتێبـی ( تاريخ نجد ) لە لاپەڕە : ٣٠٤ پاش چەند وتەیەك دەفەرمووێت (وانا كفرنا هؤلاء الطواغيت أهل الخرج وغيرهم للأمور التي يفعلونها هم.منها أنهم يجعلون أباءهم وأجدادهم وسائط.ومنها أنهم يدعون الناس الي الكفر.ومنها أنهم يبغضون عندالناس دين محمد صلى الله علية وسلم...)واتە : ئێمە ئەم تاغوتانەی ئەهلی خاریجمان کافرکردووە لەبەر کارانێك کە ئەنجامیان دەدا.لە کارەکانیان : باوك و باپیرانیان گێڕابوو بە واسیتە لە نێوان خۆیان و الله تعالی.وە هەندێکیان خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ کوفر و کومڕایی.وە هەندێکیان دینی محمدیان صلى الله عليه وسلم لای خەڵك ناشرین دەکرد.

شاهێد تێیدا : ئەویش کوفری ئەو کەسانەی کە شتانێك دەکەنە واسیتە لە نێوان خۆیان و الله تعالی.وە لە هەمان ڕیسالە لە لاپەڕە : ٣٠٥ هەندێك لە بابەتەکان ئیشکالی تێدابوو لای شێخ سليمان کوڕی سحيم کە دەفەرمووێت ( وما تقول في الذين اعتقدوا في علي بن أبـي طالب مثل اعتقاد كثير من الناس في عبدالقادر وغيره...) واتە : چمان وت دەربارەی بـیروباوڕی ئەوکەسانەی کە گۆڕی ئەبـی تالیـیـان دەپەرست بەهەمان شێوە بـیروباوڕی زۆرێك لە خەڵك ئاوایە لە عبدالقادریش وە جگە لەویش ( تێبـینی بکە کوفری ئەهلی خریج نەجد تەنها بەکردنی واسیتەبوو وە ناوەڕۆکی حوکمی لەسەر دامەزراو و ناوی کارەکەی بەهۆی کردنی پێوە لکلو کە ئەویش شیرکە) پێی دەڵێن موشریك.

" النص الثامن " دەقی هەشتەم : ڕیسالەیەکی وەڵامیە کە تێیدا ڕەتی ئەو بوختانانە دەکاتەوە کە لەدژی هەڵبەستراوە ئەویش لە کتێبی ( تاریخ نجد ) لە لاپەڕە : ٢٧٤ باسکراوە کە کۆمەڵێك بوختان و درۆیە دژی شێخ هەڵبەستراوە.

هەندێکیان شێخ محمد دانی پێدادەنێت کە وتوویەتی کە ئەوانیش (تکفير الناذر، إذا أراد به التقرب لغير الله، وأخذ النذر كذلك، ومنها: أن الذبح للجن كفر، والذبيحة حرام، ولو سمى الله عليها إذا ذبحها للجن. فهذه خمس مسائل كلها حق، وأنا قلتها) واتە : کافرکردنی ئەو کەسەی نەزر بۆ جگە لە الله تعالی دەکات.ئەگەرهاتوو بەمەبەستی نزیك بوونەوە بیت بۆ جگە لە الله تعالی وە نەزر بۆ ئەو بگرێت.وە هەروها نەزر بۆ جنۆکە بکات ئەوە کافر دەبیت.وە سەربڕاوەکەی حەرامە.ئەگەر الله تعالی ناوی لێنان ئەگەر هاتوو بۆ جنۆکە سەربڕدرا ئەوە پێنج بابەتە کە هەموویان حەقن وە من وتوومە.

تاوەکو دەگات بەوەی کە دەڵێت (صار ناس من الضالين، يدعون أناسا من الصالحين، في الشدة والرخاء، مثل عبد القادر الجيلاني، وأحمد البدوي، وعدي بن مسافر، وأمثالهم من أهل العبادة والصلاح، فأنكر عليهم أهل العلم غاية الإنكار وزجروهم عن ذلك، وحذروهم غاية التحذير والإنذار، من جميع المذاهب الأربعة، في سائر الأقطار والأمصار، فلم يحصل منهم انزجار، بل استمروا على ذلك غاية الاستمرار.أما الصالحون الذين يكرهون ذلك، فحاشاهم من ذلك" وبين أهل العلم أن مثل هذا هو الشرك الأكبر) واتە : هەندێك خەڵك کەوتنە نێو گومڕاییەوە داوایان لە کەسانێك دەکرد لە پیاوچاکان لە خۆشی و ناخۆشیدا.وەك : عبدالقادر گەیلانی و ئەحمەد بەدەوی و عەدی کوڕی موسافیر و هاوشێوە ئەوان لە لە ئەهلی تقوا و چاکە و عیبادەت دا.ئەهلی علم نکۆڵیەکی سەرسەختیان کرد لەو کارە شیرکە و ئاگاداریان کردنەوە لەوکارە.وە هۆشیاریان پێدان بەوبەڕی دڵسۆزیەوە لەهەموو زانایانی

هەرچوار مەزهەب.لـە هەموو شار و دێهاتێك هیچ كامیان گوێیان پێنەدا بەڵو هەر لـەسەری بەردەوام بوون و مانەوە.بەڵام پیاوچاكان ڕقیان لـەو شتە دەبـیتەوە حاشا ئەوان بەوە ڕازی نین.وە لە نێوان ئەهلی علم وەكو ئەمە شیركە.

شاهێد تێیدا : ناوی لە زیاڕتكارانی ئەم سێ گۆڕە پەرستراوە نا گومڕا.وە شیركی گەورەشە.

تا ئەو شوێنەی كە دەڵێت ( فتأمل هذا اذا كان كلامه هذا في علي فكيف بمن ادعى أن ابن عربي وعبدالقادر اله...)واتە : ورد ببەوە لـەوە ئەگەر هاتوو ئەمە قسەیان بـیت لـەسەر ئەمە ئەی چ بەوانە دەڵێت كە : ئیدعای دەكەن ئیبن عەرەبـی و عبدالقادر پەرستراون.

" النص التاسع " دەقی نۆیە : ئەویش ڕیسالـەیەكە كە ناردی بۆ یەكێك لـە زانایانی ئەوكاتی شاری – الاحساء – بەناوی ئەحمد كوڕی عبدالكریم كە ڕیسالـەی بـیست و یەكە لە كتێبـی ( تاریخ نجد ) لە لاپەڕە : ٣٤٦.

ئەحمەدی كوڕی عبدالكریم تووشیی تێكەڵبوون بوون لـە كردەوەی ئەوكەسەی كە گۆڕ دەپەرستێت لـەگەڵ ئەودا كە نەزانە بەو كارەی كە دەیكات.ئەحمەدی كوڕی عبدالكریم نكۆڵی دەكرد لە كافركردنی كەسی ( معین ) بەكردنی ئەم كارە لـەگەڵ نەزانینی بە حوكمی كارەكە.ئەوكات تەنها دەیون جۆری كارەكە كوفرە نەوەك شەخصەكە كافربـیت واتە : كردەوەكە كوفر و شیركە بەڵام كەسەكە نابـیتە كافر و موشریك لـەبەر ئەوەی جاهیلە بەو شیرك و كوفرەی كە دەیكات.بۆیە شێخ لە ڕیسالـەیەكە درێژ موناقەشەی ئەم بابەتەی بۆ كرد و شێخ محمد كوڕی عبدالوهاب – بەڕەحمەت بـیت –دەفەرمووێت (وتأمل تكفيره (ابن تيمية) رؤوسهم، فلانا وفلانا بأعيانهم، وردتهم ردة صريحة، وتأمل تصريحه بحكاية الإجماع على ردة الفخر الرازي عن الإسلام، مع كونه عند علمائكم من الأئمة الأربعة" هل يناسب هذا لما فهمت من

كلامه أن المعين لا يكفر، ولو دعا عبد القادر في الرخاء والشدة، ولو أحب عبد الله بن عون، وزعم أن دينه حسن، مع عبادته أبي حديدة ) واته : ورد ببەوە لە تەکفیرکردنی گەورەکانی متکلمین لەلایەن ئیبن تەیمیە بە دیاری کراوی کە دەڵێت : فلان کەس و فلان کەس ،مورتەدبوونەوە بە ڕاستەوخۆ و بەبێ پێچ و پەنا.وە ورد ببەوە لە نەقڵ کردنی ئیجماع لەلایەن ئیبن تەیمیەوە لەسەر ڕیدەت و هەڵگەڕانەوەی فەخری ڕازی لە ئیسلامدا لەکاتێکدا لەلای زانایانی هەرچوار مەزهەب ئەم حوکمە هەیە.ئەوە دەگونجێت کە وا تێبگەیت کە کەسی ( معین ) دیاری کراو کافر ناکرێت.ئەگەر هاتوو هاواری عبدالقادر بکرێت لە خۆشی و ناخۆشیدا وە ئەگەر عبداللە کوڕی عەونت خۆش بوێت و وە وا گومان ببەیت کە ینی ئەو چاکترە لەگەڵ پەرستنی ئەبی حەدیدە ، ئا ئەوانە بەدیاری کراوی کافر دەکرێن.

وە لە ڕیسالەیەکی تردا هاتووە لە کتێبی (الدرر السنيه فى الأجوبة النجدية ج : ١٠ ص : ٦٣ و ٧٤)پاش باس کردنی ئەقوالی سەلەف لەسەر کافرکردنی خاوەنی شیرکی گەورە دەفەرمووێت (قال منصور: وقد عمت البلوى بهذه الفرق، وأفسدوا كثيرا من عقائد أهل التوحيد، نسأل الله العفو والعافية" هذا لفظه بحروفه" ثم ذكر قتل الواحد منهم، وحكم ماله، هل قال واحد من هؤلاء من الصحابة إلى زمن منصور: إن هؤلاء يكفر أنواعهم[8] لا أعيان) واتە : مەنصوری بەهەتی دەڵێت : بەڕاستی بە گشتی بەڵەوی لەو گرووپەیە.وە بیروباوڕی زۆرێکی لە ئەهلی تەوحید خراپ کرد.ئەوە قسەی ئەوە لە پاشاندا باسی کوشتنی یەکێکی لەوان کرد.وە باسی حوکمی ماڵی ئەوی کرد ئایا یەکێك لەوانە هەر لە هاوەڵانەوە تا سەردەمی مەنصور ئەوەیان

[8] شێخ محمد جیاوازی ناکات لە نێوان تکفیری ( النوع ) و ( المعین ) لە شتە ئاشکراکان لە شیرکی گەورەدا.ئەوە ئیجماعی موسڵمانانی لەسەرە هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە تاوەکو سەردەمی بەهوتی.

نەوتووە.بەڵكو ئەوانە تەنها جۆری كارەكە كافر دەكات نەوەك شەخص بە دیاری كراوی.

سەیری تەكفیری شێخ محمد بكە لەسەر ئەوكەسەی كە عبدالقادر و سەرووی ئەو دەپەرەسترێت ( ئەو گرووپانەی كە ئیمام مەنصوری بەهوتی باسی دەكات لە (باب المرتد)دا بریتین لە : ئەهلی حلول و وەحدیەتی وجود و ڕافیزە شیعەكان و باتنیەكان و قەڕامیتەكان )

" النص العاشر " دەقی دەیەم : ئەویش ڕیسالەیەكە لە ڕیسالەكانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب –بەڕەحمەت بێت– بەناوی ( تفسیر كلمة التوحید ) لە مەجموعی ڕیسالە و نووسینەكانی شێخ هاتووە لە بەرگی " العقیدە " بەشی یەكەم لاپەڕە : ٣٦٣ كە شێخ دەفەرموویێت (وأنت ترى المشركين من أهل زماننا، ولعل بعضهم يدعي أنه من أهل العلم، وفيه زهد واجتهاد وعبادة، وإذا مسه الضر، يستغيث بغير الله، مثل: معروف، وعبد القادر الجيلاني، وأجل من هؤلاء، مثل: زيد بن الخطاب، والزبير وأجل من ذلك مثل: رسول الله صلى الله عليه وسلم. فالله المستعان! وأعظم من ذلك، وأعظم: أنهم يستغيثون بالطواغيت، والكفرة المردة، مثل: شمسان" وإدريس، ويوسف، وأمثالهم" والله أعلم) واتە : تۆ موشریكانی سەردەمی خۆمان دەبینیت.لەگەڵ ئەوەشدا هەندێكیان بانگەشەی علم دەكەن وە زوهد و تێكۆشان و عیبادەتیشیان هەیە.بەڵام كاتێ تۆشی ناخۆش دێن هانا و هاوار بۆ غەیری الله تعالى دەبەن.نمونەی : مەعرووفی كەرخی و عبدالقادری گەیلانی و وە چاكتر لەوان وەك : زەیدی كوڕی خەتاب و زوبەیری و وە چاكتر لەوان نمونەی : پێغەمبەر محمد صلی الله علیە وسلم.الله پشتیوان بێت.وە گەورەتر لەوە كە : هاوار و هانا دەبەن بۆ تاغوتان و كافران و مرتدان نمونەی : شەمسان و ئیدریس و یوسف و هاوشێوەی ئەوان الله اعلم.

شاهێد تێیدا : هەر لە سەرەتای ڕیسالەکەوە ناوی لەم تاغوت پەرستانە نا موشریکەکان ".. وأنت ترى المشركين ..." کاتیٚ کە وەسفی کردن بەوە کە هانا و هاوار بۆ غەیری الله تعالى یان برد.ئایا دەگونجێت ناویان ببەین بە موسڵمان وە ناوی ئیسلام و ئیمانیان پێوە بلکێنین ؟ لە کاتێکدا هاوار و هانایان بۆ جگە لە الله تعالى بردووە . نەخێر ناگونجێت و شتێکی مەحاڵە لە شەریعەت دا لەبەر ئەوەی ئیسلام و شیرك دوو شتی دژ بەیەکن و هەرگیز بەیەکەوە کۆ نابنەوە.

" النص الحادي عشر " دەقی یازدەیەم : ئەم دەقە دەکەینە کۆتا وتە کە ئەم بابەتە زۆر بەجوانی و چاکی ڕوون دەکاتەوە.وە بۆمان ڕوون بۆیەوە کە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب جەهل بە عوزر نازانێت ( عدم عذر بالجهل ) لە شیرکی گەورەدا. لە داهاتوودا باسی ئەوە دەکەین کە لە ڕیسالەیەك.وە ناویشی لێناوە (من وقع في الشرك الأكبر جهلا مشريكا الا في المسائل الخفية) واتە : هەرکەسیٚ کەوتە نێو شیرکی گەورەوە بە نەزانی ئەوە موشریکە ئیلا لە بابەتە شارەوەکان نەبێن ، بەڵام پەرستنی گۆڕ و تەواف کردن لەسەری لە شیرکی ئاشکرایە نەوەك شارەوەکان بەڵام کافرکردنیان ئەگەر ئیقامە حوجە کرابن بەڵام دەعوەیان پیٚ نەگەیشتبێت ئەوە ئەم سێیە[٩] کافر دەکرێن.بەڵام ئەگەر غەیری ئەم سێیانە بوون ئەوە ئەوکات ئیقامە حوجەیان دەکرێت و ناوی شیرك و کوفر واتە ( موشریك و کافر )یان پێوە دەلکێنین.

شێخ سەیری بەوە هاتووە چۆن گومانتان بۆ درووست بووە لە کافرکردنی تاغوتان و شوێن کەوتووانیان. وە ئایا ئیقامە حوجە دەکرێن یان نا ؟

---

[٩])واتە : شیرکی ئاشکرا و ئیقامە حوجە و دەعوەی پیٚ نەگەیشتبێت ، ئەم ڕیسالەیە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب نووسی بۆ هەندێك لە قوتابیەکانی لە شاری "الدرعيه" ئەوە لە کاتێکدا بوو شێخ سەرەتای بانگەوازی بوو بۆ تەوحید لە شاری "العيينه " وە قوتابیەکانی بریتی بوون لە : عیسی کوڕی قاسم و ئەحمەدی کوڕی سلیم ..هتد کە ناویان هاتووە لە کتێبی ( تاريخ نجد ) لە لاپەڕە : ٤١٠.

شێخ محمد نکۆڵی لەوە کردووە کە بوەستین لە کافرکردنی[10] ئەم تاغوتانە و شوێن کەوتووانی لەبەر ئەوەی نەزان و جاهیلن بۆیە پێویست بە ئیقامە حوجە ناکات،وە فەرمووی : ئەی من پێشتر ئاگادارم نەکردنەوە لە وتەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کە : هەرکەسێ نکۆڵی فلان شت و فلان شت بکات و وە ئیقامە حوجەی لەسەر بکات[11] وە لەکاتێکیشدا ئێوە هەر گومانتان هەبیت لە کافر کردنی ئەم تاغوتانە و شوێنکەوتووانیان وە گومانتان هەبیت لەوەی ئایا ئیقامە حوجە دەکرێن یان نا ئەوە بەڕاستی جێی سەرسام بوونە سەیرم بەوە دێت چۆن گومانی واتان بۆ درووست بووە لە کاتێکدا من چەندین جار بۆ ئێوەم ڕوون کردۆتەوە.ئەوانە پێویست بە ئیقامە حوجە ناکات لەسەریان.

بەڵکو ئیقامە حوجە لەسەر ئەو کەسانە دەکرێت کە (حديث عهد بالاسلام م أوالذي نشأ ببادية بعيدة أو في مسائل الخفية مثل : الصرف والعطف) واتە : مردووە پێش ئەوەی ئیسلامی پێ بگات یان لە ناوچەیەکی دوورە دەست گەورە بووە یان لە بابەتە شاراوەکان وەك : : الصرف : کردەوەیەکی سیحرە و خۆشەویستی بۆ ڕق دەگۆڕێ.

---

[10] پێویستە تێبینی وشەی شێخ بکەیت ئەوەی نکۆڵی لە قوتابیەکانی دەکرد لەسەر بەکار نەهێنانی ( اسم الكفر ) بۆ ئەو تاغوتانە بەڵام ( اسم الشرك ) پێوەی دەلکێنێ واتە پێی دەڵێت : موشریك بەڵام کافر نا دەوەستیت لەسەر ئیقامە حوجە.بۆیە هەردەم وریابە لەوەی کاتێ شێخ نەفی دەکات.ئەو زۆر ورد بۆیە دەبیت تۆوش ورد بیت لەگەڵی.ئەو تەنها نەفی ( اسم الكفر ) دەکات بەڵام ( اسم الشرك ) هەر لەسەریان دەمێنێت. بە ویستی الله تعالى ئەم بابەتەت زۆر بۆ دووبارە دەکەمەوە بۆ ئەوەی باش تێبگەیت و لەبەری بکەیت.

[11] واتە : ئیقامە حوجە ناکرێت لەکاتی لکاندی ( اسم الكفر ) بەسەریان وە معذب دەبیت یان دەکوژرێت.بەڵام ئەم سێ چینە لەگەڵ ئەوانیش ئەوەی لە شاری کافران بژیت.ئەوانە ئەگەر هاتوو شیرکین کرد ئەوەی ( اسم الشرك )یان پێوە دەلکێ بەڵام ئیقامە حوجە ناکرێت لەسەر کوشتنیان یان شەڕکردن دژیان و تعزیبدانیان وە هەروەها ( اسم الكفر )یان پێوە نالکێ.

والعطف : ئەویش کردەوەیەکی سیحرە بۆ گۆڕینی ڕق بۆ خۆشەویستی.ئەوانە کافر ناکرێن تاوەکو دەیناسن بەڵام بنەماکانی دین ( أصول الدین ) کە الله تعالی ڕوونی کردۆتەوە وە لە قورئانەکەی باسی کردووە چوونکە بەڵگەی الله تعالی قورئانە هەرکەسێ قورئانی پێ بگات ئەوە بەڵگەی پێ گەیشتووە و بۆتە ئیقامە حوجە.

بەڵام ئەصڵی ئیشکال ئەوەیە کە ئێوە جیاوازانی ناکەن لە نێوان ( قیامە الحجە ) و ( فهم الحجە ) زۆرینەی کافران و مونافیقان لە حوجە و بەڵگەی الله تێناگەن لەگەڵ ئەوەشدا ئیقامە حوجە کراون وەك الله تعالی دەفەرمووێت ﴿أم تحسب أن أكثرهم يسمعون أو يعقلون ان هم الا كالأنعام بل هم أضل سبـيلا﴾ الفرقان – ٤٤ واتە : ئایا وادەزانیت زۆربەی ئەوانە ڕاستیەکان دەبـیستن.یان بـیرو هۆشیان دەخەنە کار ؟ ئەوانە ماڵات نەبـیت هیچی تر نین بەڵکو گومڕاتریشن لە ماڵات.

ئیقامە حوجە و گەیشتنی جۆرێکە وە تێگەیشتن لەو حوجە و بەڵگەیە جۆرێکی ترە.کافر دەکرێن بە پێگەیشتنی بەڵگە پێیان وە یان لێی تێنەگەیشتن پێی.

لەپاشان باسی کەسانێك دەکات کە ئیقامە حوجەیان کراوە بەڵام لێی تێنەگەیشتوونە ئەویش لەوانە : خەواریجەکان بەتایبەت غولاتی خەواریج کە ئیمامی علی سووتاندینی وە هەروەها غولاتی قەدەریەکان لە پاشاندا دەفەرمووێت : ئەگەر ئەوەتان زانی ئەوە ئەوەیە کە دەبـی ئێوە لەسەری پابەند بن.بۆیە گومان هەبوون لە کەسانێك کە تاغوتان دەپەرستن و وە دوژمنایەتی دینی ئیسلام دەکات وە وا گومان ببەن ئەوکاتە مورتەد دەبنەوە کە تێبگەن لە حوجە و بەڵگە ئەوە شتێکە دوورە لە مەنهەجی پێشینانمان.

کورتەی ئەم ڕیسالەیە ئەوەیە کە : شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب –بەڕەحمەت بـیت – نکۆڵی کردووە لە قوتابـیەکانی کە بوەستن لەسەر تەکفیرکردنی ( سەیرکە دەڵێت : تەکفیریی تاغوتان ..) ئەم تاغوتانە و شوێنکەوتووانیان بەبۆنەی هەبوونی جەهل و

نەزانینیان و هەبوونی ئیقامە حوجە لەسەریان وە نەزان و جاهیل لە تێگەیشتنیان لەم بەڵگەیە لەبەر ئەوەی کە جاهیلن.ئەوە بەڕاستی شتێکی هەڵەیە.وە ئامۆژگاری قوتابیـیەکانی کرد کە نەوەستن لە تەکفیرکردنی کەسانی جاهیل ئیلا سێ کەس نەبن :(حديث عهد بالاسلام أوالذي نشأ ببادية بعيدة وفي بعض رسائله أضاف شخصا اخر وهو من نشأ وعاش بلاد الكفر أو في مسائل الخفية مثل : الصرف والعطف) واته : مردووە پێش ئەوەی ئیسلامی پێ بگات یان لە ناوچەیەکی دوورە دەست گەورە بووە و ژیاوە یان لە هەندێك ڕیسالەکانی تری شێخ شتێك ئیزافەکراوە ئەویش : ئەویش کەسێکە کە گەورە یان ژیا بـیت لە وڵاتی کوفردا یان لە بابەتە شاراوەکان.وە بۆشمان ڕوون بۆیەوە کە پەرستنی گۆڕ کە بابەتە شاراوەکان نیە.

وە پێویستە لە شتێك تێبگەیت کە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب تەکفیری ئەم سێ چینەی نەکردووە وە ناوی کوفری نەلکاندووە پێیانەوە لەبەر ئەوەی ئەم سێ چینەی سەرەوە بەڵگەیان نەبـیستووە وە دەعوەشیان پێ نەگەیشتووە بەڵام ناونانیان بە ( موشریك )لکانتدووە پێیانەوە وە ناوی بردوون بە بەندەی جگە لە الله تعالى وە لەگەڵ الله تعالى ئیلاهی تریان هاوبەش کردووە وە نەفی ئیسلامیان لەسەر دەکات بەڵام پێیان دەوترێت : موشریك چوونکە کردەوەی شیرکین کردووە بۆیە تەنها بە کردەوەی شیرکیان ئەوەمان بۆ پشت ڕاست دەبـیتەوە کە موشریکن.

بەڵام ناوی ( کفر ) وە حوکمی کوفری لە : کوشتن و تەعزیب پێوەی نەلکاندوونە لەبەر ئەوەی ئیقامە حوجە نەکراون چوونکە : کوفر واتای ئینکاری کردن و یان بەدرۆ زانینی نێردراوی الله تعالى یان بەدرۆ زانینی ئەو شتانەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێناویەتی دواتر ئینکاری لێبکەیت یان عینادی بکەیت بەرامبەری یان پشتی تێبکەیت ڕووت لێی وەرگێڕی.ئەوەش بە واتای ئەوەیە کە پێغەمبەر هەواڵی بۆ

بردوون ئەوكات دەبیتە ئیقامە حوجە لەسەریان.بەڵام ناوی شیرك بەهۆ پەرستنی غەیری الله تعالی یە.هیچ پەیوەندیەكی بە حوجەوە نیە.وەك شێخ ئیبن تەیمیە لە كتێبی ( مجموع الفتوی ج :٢٠ ص : ٣٧ و ٣٨ )وا دەفەرموویێت.بەڕاستی ئەوە بابەتێكی ۆر گرینگ و پێویستە دەفەرموویێت : ناوی ( موشریك )جێگیر دەبیت پێش ئەوەی ڕیسالەی الله تعالی بیت.واتە پێش ئیقامە حوجە.لەبەر ئەوەی شیركی بە الله تعالی كردووە و شتانێكی تری كردۆتە هاوبەش لە پەرستن و خودایەتیدا.وە لەسەرت پێویستە كە تێبگەیت كە شێخ دەفەرموویێت ( لا أكفر كذا وكذا ) كافری ناكەم فلان و فلان شت.ئەوە تەنها نەفی ( اسم الكفر )دەكات (ئاگاداری ئەم خاڵە بە) بەڵام ئەوە واتای ئەوە نیە كە ناوی كوفری لەسەر نەفی كرا پێی بڵێین ( موسڵمان )یان حوكمی موسڵمانانی پێ ببەخشین.نا بەڵكو شێخ جیاوازی دەكات لە نێوانیان.

پاش ئەوەی كە دەقە و وتەكانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب-مان خستە ڕوو لەسەر ئەم بابەتە بۆمان ڕوون بۆیەوە كە شێخ كەسی نەزان كافر دەكات پاش ئەوەی كە دینی الله تعالی ئاشكرا ببوو.ئیلام كەسانێكی دیاری كراو كافریان ناكات بەڵام ناوی موسڵمان یان موحیدی لێنانێت بەڵكو موشریكن وەك ئەهلی بادی و ئەوەی لە لاچەپ ژیابیت و ڕیسالەی پێ نەگەیشتبیت یان مردووە پێش ئەوەی ئیسلام بیت یان لە وڵاتی كوفردا گەورە بووبیت و ژیابیت.بەڵام جگە لەوان عوزریان نیە لە ناوی كوفر لێنانیان ( اسم الكفر )بەڵام ناوی شیرك هەركەسێ كردەوەی شیركی كردبیت ئەوە ئەم ناوی ( موشریك ) پێوەی دەلكێت هیچ كەسێكیان عوزریان نیە نە ئەو سێ چینە نە جگە لەوانیش هەموویان پێیان دەوترێت ( موشریك).

شێخ ئیسحاقی كوڕی عبدالرحمن كە لە نەوەكانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهابە كاتێ ئەم قەزیەلە كتێبەكەی خۆی بەناوی ( تكفیر المعین ) لە لاپەڕە : ١٦ دەخاتە

ڕوو،بۆیە هیچ نامۆ نیە کە یەکەم کەسێك لە وتەکانی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب تێبگات کوڕ و نەوە و قوتابــیەکانیەتی

شێخ ئیسحاق پاش چەند قسەیەك دەفەرمووێت (فنذكر من ذالك شيئا يسيرا لأن المسألة وفاقية والمقام مقام اختصار.فلنذكر من كلامه ما ينبهك على الشبهة التي استدل بها من ذكرنا في الذي يعبد قبة الكواز وأن الشيخ توقف في تكفيره ( لاحظ التوقف في اسم التكفير أما كونه مشركا فلم يتوقف الشيخ فيه لأنه سماه يعبد قبة كذا وكذا ولايمكن أن يعبد غير الله ويسمى مسلما أبدا لأن الاسلام والشرك ضدان لا يجتمعان) ونذكرا أولا مساق الجواب.وماالذي سبق لأجله وهو أن الشيخ محمدا رحمه الله ومن حكى عنه هذه القصة يذكرون ذالك معذرة له عما يدعيه خصومه علية من تكفير المسلمين ( والشيخ لا يكفر المسلمين لأن كلمة مسلمون كلمة عامة وفيهم من لم تقم عليه الحجة في استحقاق اسم الكفر ) والا فهي نفسها دعوى لا تصلح أن تكون حجة بل تحتاج لدليل وشاهد من القرأن والسنة..الخ) واتە : من لێرە تەنها شتێکی کەمت بۆ باس دەکەم چوونکە لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە بابەتێکە لەسەری کۆکن و خیلافی تێدا نیە.وە شوێن شوێنی کورت باس کردن و کورت کردنەوەیە.من لە وتەی شێخ محمد ئاگادارت دەکەمەوە لە گومانێك کە لەسەر شێخ درووست بووە و بە بەڵگە دەهێنرێتەوە لە تەکفیر نەکردنی موشریان.ئەویش لە بابەتی ئەو کەسانەی کە قوبەی کواز دەپەرستن وە شێخ محمدیش بە ڕەحمەت بــیت لە تەکفیر کردنیان وەستابــیت ( تێبــینی بکە وەستان لەسەر ناوی تەکفیرکردن بەڵام ناونانیان بە موشریك ئەوە شێخ لەسەری نەوەستاوە لە موشریك دانانیان لەبەر ئەوەی ناوی لە قوبە پەرستان نا موشریك وە ناگونجێت کەسێك پەرستنی غەیری الله تعالی بکات پێی بوترێت موسڵمان هەرگیز ناگونجێت لەبەر ئەوەی ئیسلام و شیرك دژە یەکن هەرگیز کۆنابنەوە )سەرەتا

باسی ناوەڕۆکی وەڵامەکەت بۆ دەکەم وە ئەو شتەی کە لە پێناوی هاتووە کەئەویش شێخ محمد بەڕەحمەت بیت.وە ئەوەشی لێی دەگێڕتەوە باسی ئەوە دەکەن کە شێخ وەك عوزرێك بۆ ئەو کەسانەی ئیدعای دوژمنایەتی ئەو دەکەن لەسەر تەکفیری موسڵمانان.بەڵام شێخ محمد هەرگیز تەکفیری موسڵمانان ناکات.لەبەر ئەوەی وشەی (المسلمین) وشەیەکی گشتیە تێیدایە ئیقامە حوجەی ناکرێت بە لکاندی نای کوفر (اسم الكفر)بۆی.ئیلا شتێك بیت کە ئیقامە حوجەی پێویست نەکات.بەڵکو پێویستی بە بەڵگە و شاهێدە لە قورئان و سوونەت.

وە لە پاشان لە لاپەڕە : ١٩ هەمان کتێب شێخ ئسیحاق دەفەرموویت (وتوقفه رحمه الله أي توقف الشيخ محمد بن عبدالوهاب في بعض الأجوبة يحمل على أنه الأمر من الأمور وأيضا في كما ترى توقف مرة كما في قوله ( وأما من أخلد الى الأرض فلا أدرى حاله ) فيا الله العجب كيف يترك قول الشيخ في جميع المواضع مع دليل الكتاب والسنة وأقوا ابن تيمية وابن قيم كما في قوله ( .. من بلغه القرأن فقد قامت عليه الحجة ...) ويقيل في موضع واحد مع الاجمال) واتە : وەستانی ڕەحمەتی واتە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە هەندێك وەڵام ئەوە هەڵدەگریٚ کە کارێك لە کارەکان وە هەروەها وەك بینیمان وەستاوە لە تەکفیرکردن لە قسەی ( بەڵام ئەو کەسانەی کە لەسەر ئەم حاڵە مردوون و خراوتەوە گۆڕەوە نازانم حاڵی چۆنە ) والله سەیرە چۆن وتەی شێخ لە هەموو شوێنەکانی کە نەوەستاوە لە تەکفیرکردنیان کە بە بەڵگەی قورئان و سوونەت هێناویەتی واز لێبهێنیت وە وازلە وتەکانی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و قوتابیەکەی ئیبن قەیم بهێنیت.کە دەفەرموویت (... هەرکەسیٚ قورئانی پێبگات ئەوە بۆتە ئیقامە حوجە بۆی...) وە یەك وتەی وەرگری لە یەك شوێن لەکاتێکدا بە گشتی باسی کردووە.

## دەتوانین لە وتەکانی شێخ ئیسحاق چەند شتێك کورت بکەینەوە :

یەکەم : شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ئەگەر هاتوو نەفی کرد لەوەی تەکفیرکردنی گۆڕپەرستەکان بکات ئەوە مەبەستی نەفی گشتیە ( نفی العموم )لەبەر ئەوەی ئەوەی ئیقامە حوجەی نەکراوەوەك : سێ چینەکە ناویان لێنانرێت کافر بەڵام ( اسم الشرك ) ناوی شیرکی پێوە دەلکێ لەبەر ئەوەی کردەوەی شیرکیان کردووە و بەڕاستیان داناوە.هەرکەسێ بە شێوەی گشتی یان بلێین بە گشتی گۆڕ بپەرستێت ئەوە ئەوکات بە ڕەهایی پێی دەڵێین ( موشریك ) هیچ کامیان جیا ناکرێتەوە بەڵام ( اسم الکفر ) ناوی کوفر ئەوە تەفصیلی تێدایە بە نیسبەت گۆڕپەرستەکان بەپێی ئیقامە حوجە.شێخ محمد زۆر ورد بووە لەناوەکان وە جیاوازی کردن لە نێوانیان بە ئیعتباری ئیقامە حوجە کە بەویستی الله تعالی لە داهاتوودا دێتە پێشمان و زیاتر ڕوون دەبـیتەوە لە وتەی قوتابـیەکانی شێخ بەتایبەتی وتەی ئەو کەسانەی زۆر ملازەمەی شێخیان کردووە.

ئەوەش بە واتای ئەوە دێت هەموو کەسێك لای گۆڕ بـیت کافر ناکرێت بەڵام هەموو تاکێك پەرستشی بکات پێی دەوترێت ( موشریك )لێرە سێ کەس گۆڕ دەپەرستن تەکفیریان ناکرێت لەبەر نەبوونی ئیقامە حوجە بەلـچام پێشیان ناوەترێت ( موسڵمان )کە ئەویش ئەو سێ چینەیە کە لەسەرەوە باسمان کرد.بەڵاك کافرکردنی هەموو تاکێکی گۆڕ پەرست دەشێ ئەم سێ چینەی تێ بکەوێت جا بۆیە لەم چوار چێوەیە پێویستە لە وتەکان تێبگەیت ئینجا بڕیار بدەیت.

دووهەم : ئەوەمان بۆ کورت دەبـیتەوە کە : شێخ محمد وەستاوە لەسەر ناوی کوفر ( اسم الکفر) نەوەکو ناوی شیرك ( اسم الشرك )ئەگەر لەهەندێك شوێن باسی کردبـیت بەڵام وەك ئەچلێ و بنەما وانیە.

## بەشي پێنجەم

## وەڵامی هەندێك لەو ڕیسالانەی کەپێویست بوون کە وەڵامی تێدابوو بۆ ئەوکەسانەی کە لە وتەی شێخ تێنەگەیشتبوون

" النص الأول " دەقی یەکەم : ئەویش ڕیسالەیەکە کە ناردوویەتی بۆ شریف کە لە کتێبـی

( تاريخ نجد ) لە لاپەڕە : ٤٠٧ کە ئەو ڕیسالەیە نزیکی دوو لاپەڕە و نیوی گرتووە کە تێیدا شێخ لە پێشەکیەکەیدا دەفەرمووێت (سألني الشريف عما نقاتل عليه، وما نكفّر به الرجل) واتە : شەریف پرسیارم لێدەکات دەربارەی ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ دەکەین وە ئەوانەی کافریان دەکەین ( تێبـینی بکە پرسیار دەربارەی تەکفیر و کوشتنە )دیارە شێخ محمدیش بە درێژی وەڵامی دەداتەوە[12] لە پاش ئەوەدا شێخ محمد دەچێت بۆ وەڵام دانەوەی گومانێك کە دژ بە ئەو بڵاوکراوەتەوە کە ئەویش : ( شێخ تەکفیری عموم واتە گشتی دەکات ) ئەم باسە موحەقە بەو ڕیسالەی سەرەوە کە تێیدا شێخ لە وەڵامی ئەم گومانەدا دەفەرمووێت (وأما الكذب والبهتان، فمثل قولهم: إنا نكفر بالعموم، ونوجب الهجرة إلينا على من قدر على إظهار دينه، وإنا نكفر من لم يكفر، ومن لم يقاتل، ومثل هذا وأضعاف أضعافه، فكل هذا من الكذب والبهتان، الذي يصدون به الناس عن دين الله ورسوله.وإذا كنا لا نكفر من عبد الصنم، الذي على عبد القادر، والصنم الذي على قبر أحمد البدوي، وأمثالهما، لأجل جهلهم، وعدم من ينبههم، فكيف نكفر من لم يشرك بالله إذا لم يهاجر إلينا، أو لم يكفر ويقاتل؟{سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ} سورة النور آية: ١٦ بل نكفر تلك الأنواع الأربعة، لأجل محادتهم

---

[12] )بۆ زانینی وەڵامی شێخ کە زۆر پێویستە بـیخوێنیتەوە سەیری کتێبـی (الدرر السنية في الأجوبة النجدية) بەرگی : ١١ لاپەڕە : ٣١٧

لله ورسوله ( لأنهم عرفوا ومن حاد وعاند فقد قامت عليه الحجة فيستحق اسم الكفر ) فرحم الله امرأ نظر نفسه، وعرف أنه ملاق الله، الذي عنده الجنة، والنار" وصلى الله على محمد وآله، وصحبه وسلم) واته : بەڵام ئەم درۆ و بوختانەی کە بۆمکراوە نمونەی قسەکانیان : کە ئێمە تەکفیری عموم دەکەین وە واجب دەکەین کە هیجرەتمان بۆ لا بکەن لەسەر ئەو کەسەی کە تواناى ئاشکرا کردنی دینەکەی هەیە.وە گوایە ئێمە ئەوکەسانەش کافر دەکەین کە کافر ناکەن.وە شەڕ ناکەن لەگەڵمان دژی کافران.نمونەی ئەو قسانەش و زۆرتر و زۆرتر.هەموو ئەوانە لە درۆ و بوختان چیتر نین.کە ڕێگری لێ خەڵك دەکەن لە تێگەیشتنیان لە دینی الله تعالی.لە کاتێکدا ئێمە گۆڕپەرستان تەکفیر ناکەین ئەو کەسانەی لەسەر گۆڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی و وە ئەو بتەی کە لەسەر گۆڕی ئەحمەد بەدەویە وە هاوشێوەی ئەوانیش لە پیاوچاکان بەهۆی جەهلەوە و نەبوونی کەسێك کە هۆشیاریان بکاتەوە.چۆن تەکفیری کەسێك دەکەین کە شیرکی بۆ الله تعالی بڕیارنەداوە وە ئەگەر بۆلامان کۆچ نەکات و وە لەگەڵمان کافر نەکەن وە شەڕ نەکەن ( واتە : پاك و پێگەردی بۆ الله تعالی ئەوە بەڕاستی بوختانێکی گەورەیە ) بەڵکو ئێمە ئەو چوار جۆرە کافر دەکەین : ئەویش لەپێناو ئەوەی کە دژایەتی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی دەکات ( لەبەر ئەوەی دینی الله تعالی زانی بۆیە هەرکەسێ دژایەتی بکات و نکۆڵی بکات ئەوە ئیقامە حوجە کراوە ئەوکات موستەحەقی ناوی کوفر دەبیت واتە : تەکفیر بکرێت )ڕەحەتی الله تعالی لەکەسێك سەیرێکی خۆی دەکات و بوختان ناکات.وە ئەوەش بزانە ئێمە دەگەینەوە بە دیداری الله تعالی.کە خاوەنی بەهەشت ودۆزەخە وصلى الله على محمد وعلى اله وصحبه وسلم.

شاهێد تێیدا ( ..وإذا كنا لا نكفر من عبد الصنم، الذي على عبد القادر، والصنم الذي

على قبر أحمد البدوي، وأمثالهما، لأجل جهلهم، وعدم من ينبههم...) نەفی تەكفیركردنی شێخ واتای ئەوە نیە پێی بگوترێت ( موسڵمان ) یان موسڵمانە بەڵكو ( موشریكێكی جاهیلە )

" النص الثاني " دەقی دووهەم : ئەویش ڕیسالەیەكی كۆنە كە لەسەرەتاكانی دەعوە بوو لە شاری ( العيينه ) بۆ سویدی عێراقی نارد كە ناوی عبدالرحمن كوڕی عبدالله بوو كە یەكێكە لە زاناكانی عێراق كە لە كتێبی ( تاريخ نجد ) لاپەڕە : ٣٢٠ كە ڕیسالەیەكە تێیدا شێخ وەڵامی هەندێ پرسیاری سویدی دەداتەوە.سویدی پرسیار لە شێخ دەكات دەربارەی قسەی خەڵك دەربارەت كە دەڵێن : شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب ( أنه يكفر جميع الناس ) واتە : خەڵك هەموو كافر دەكات ( تێبینی : شێخ لە ڕیسالەی سەرەوە وەڵامی ئەم بوختانەی دایەوە كە تەكفیری عموم دەكات واتە تەكفیری گشتی ) بەڵام لێرەش شێخ دووبارە وەڵام دەداتەوە و دەفەرمووێت (ما ذكرتم أني أكفر جميع الناس، إلا من اتبعني، وأني أزعم أن أنكحتهم غير صحيحة. فيا عجبا كيف يدخل هذا في عقل عاقل؟! وهل يقول هذا مسلم؟ إني أبرأ إلى الله من هذا القول، الذي ما يصدر إلا عن مختل العقل، فاقد الإدراك" فقاتل الله أهل الأغراض الباطلة.وكذلك قولهم، إني أقول: لو أقدر على هدم قبة النبي صلى الله عليه وسلم لهدمتها.

وأما دلائل الخيرات، وما قيل عني: أني حرقتها، فله) واتە : هەرگیز باسم نەكردووە بۆتان كە من هەموو خەڵك كافر دەكەم جگە لەوانەی كە شوێنم كەوتوونە.یان من گومانی وام بردبێت كە نیكاحی ئەم خەڵكە هەمووی باتڵە و درووست نەبووە.بەخوا سەیرە ئەوە چۆن دەچێتە عەقڵی ژیرێك ؟ وە ئایان ووتومانە ئەوە موسڵمانە ؟ من خۆم بەری دەكەم لای الله تعالى لەم قسەیە.كە دەرنەچووە ئیلا مەگەر لە عەقڵێكی خراپ و

پیسەوە نەبـیت.کە تێگەیشتنی بی شتەکان لـێ ون بووە.دەك الله تعالى ئەهلی ئەم دڵ پیس و نیەت پیسانە بکوژێت.وە هەروەها ئەوە قسە بوختانەی کە گوایە وتوومە : ئەگەر توانام هەبوایە لـە ڕووخاندنی قوبەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلـم ئەوە دەم ڕووخاند وە هەروەها بابەتی سوتاندنی کتێبـی ( دالائل الخيرات ).

لەپاشان شێخ دەگەڕێتەوە سەر ئەم بوختانەی کە گوایە من تەکفیری عموم – گشتیم کردووە بۆیە دەفەرموویێت (وأما التكفير: فأنا أكفر من عرف دين الرسول، ثم بعدما عرف، سبه، ونهى الناس عنه، وعادى من فعله، فهذا هو الذي أكفره، وأكثر الأمة – ولله الحمد – ليسوا كذلك)

واتە : وە لـە تەکفیرکردن : من ئەو کەسە کافر دەکەم کە دینی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلـم دەناسێت.بەڵام پاش ئەوەی کە ناسیی جوێنی پێدەدەات وە ڕێگری لـە خەڵك دەکات کە دین بناسن.وە دوژمنایەتی ئەو کەسەش دەکات کە دینی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی ناسیووە.ئائەوەیە کە ئێکە بەکافری دەزانین و کافری دەکەین ( تێبـینی بکە ئەو کەسە دینی ناسی بەڵام نکۆڵی لـێکرد بۆیە ناوی کوفر ( اسم الكفر)ی پێوە لـکاوو موستەقی تەکفیرکردنی بوو.لـەبەر ئەوەی کوفر نکۆڵی لـێکردنە )وە زۆربەی ئومەت سوپاس بۆ الله تعالى لـەو کەسانە نین ( واتە : زۆرینەی نکۆڵی ( جحود ) ناکات بەڵکو یان جاهیلـە یان تاویلی هەیە بەڵام ئەو شتانە سوودی نابـیت بۆی لـە بابیی شیرك )

" النص الثالث " دەقی سێهەم : ئەویش ڕیسالـەیەکە کە بۆ محمدی کوڕی عیدی نارد کە یەکێکە

لـە زانایەکانی شاری – ثرمدا – کە ڕیسالـەیەکی درێژە پێك هاتووە لـە حەوت پەڕ کە ڕیسالـەیەکی وەڵامە کە تێیدا شێخ هەندێك ڕەد لـەسەر ڕیسالـەکە دەنوسێت بۆ محمدی کوڕی عید.کە ئەویش لـە کتێبـی ( تاريخ نجد ) لـە لاپەڕە : ٢٦٣ هاتووە :

سەرەتا شێخ محمد باس لە چوار شت دەکات کە پێویستە لێی بیتە جێ ئەویش :
یەکەم : " أنه بین التوحید " واتە : تەوحیدی لا ڕوون بیت.
دووهەم : " بیان الشرك " واتە : ڕوون بونەوەی شیرك.
سێهەم : " أنه یکفر من بان له التوحید " واتە : ئەو کەسە کافر دەکەین کە تەوحیدی بۆ ئاشکرابووە ( تێبینی بکە وشەی – بان – بۆی واتە : کافر ناکرێت تاوەکو دینی الله تعالی نەناسێت وە بۆی ئاشکرا نەبیت.چوونکە تەکفیرکردن پەیوەستە بە ئیقامە حوجەوە وە نەی ووتووە ئەوانە موشریك نین ئەگەر کردەوەی شیرکی کردبیت.چوونکە شیرك پەیوەندی بە وشەی – بان – نیە.

چوارەم : " أنه یأمر بقتال من بان له التوحید " واتە : وە فەرمانی شەڕیان بەرامبەر دەکرێت ئەوکەسەی تەوحیدی بۆ ئاشکرا بووە و نکۆڵی لێکردووە ( تێبینی بکە وە هەروەها لێرەش کوشتن و کوشتاری پەیوەستە بە ئیقامە حوجەوە ).
شاهێد لەوە کە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دەفەرموویێت : " أنه یکفر من بان له التوحید " واتە : ئەو کەسە کافر دەکەین کە تەوحیدی بۆ ئاشکرابووە.
ئەوەش دەقی خاڵی سێهەمە کە دەفەرموویێت (الثالثة: تكفير من بان له أن التوحيد هو دين الله ورسوله، ثم أبغضه ونفر الناس عنه، وجاهد من صدق الرسول فيه، ومن عرف الشرك، وأن رسول الله صلى الله عليه وسلم بعث بإنكاره، وأقر بذلك ليلا ونهارا، ثم مدحه وحسنه للناس، وزعم أن أهله لا يخطئون، لأنهم السواد الأعظم وأما ما ذكر الأعداء عني، أني أُكَفِّر بالظن وبالموالاة، أو أكفّر الجاهل الذي لم تقم عليه الحجة، فهذا بهتان عظيم، يريدون به تنفير الناس عن دين الله ورسول) واتە : سێهەم : تەکفیرکردنی ئەوکەسانەی کە تەوحیدیان بۆ ئاشکرابووە کە دینی الله تعالی و پێغەمبەرەکەیەتی صلی الله علیه وسلم.لەپاشان ڕقی بەرامبەر ئەم دینە هەڵگرت وە خەڵکی لێ

دوورخستەوە.وە تێكۆشا دژی ئەو ڕاستیانەی كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تێیدا بوو.وە ئەو كەسەی شیركی ناسی.وە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نێردرا بە نكۆڵی كردن لێی.وە دانی بەوە دانا شەو و ڕۆژ.لە پاشاندا بۆ خەڵكی جوان كردن و پیایدا هەڵدا وە وا گومانی برد كە ئەهلەكەی هەڵە ناكەن.لەبەر ئەوەی ڕەشایی گەورەن.وە دەربارەی ئەو شتەی كە دوژمنەكانم باسی دەكەن دەربارەی من كە گوایە من خەڵك كافر دەكەم تەنها بە گومان و موالات یان كافركردنی جاهیلێك كە ئیقامە حوجەی لەسەر نەكراوە.بەڕاستی ئەوە بوختانێكی گەورەیە.دەیانەوێت خەڵك لە دینی الله تعالی دوور بخەنەوە.

( تێبــینی قسەی شێخ بكە بە تایبەت ئەم چەند دێڕەی كۆتایی بە دیاری راوی (أو أكفّر الجاهل الذي لم تقم علیه الحجة) جاهیل ئەگەر هاتوو ئیقامە حوجەی لەسەر نەكرابوو واتە ( فاعل الشرك : بكەری شیرك ) كافر ناكرێت بەڵام پێی ناگوترێت ( موسڵمان ) وە پێی ناگوترێت ( یەك خوا پەرست ) وە جیاوازی نێوان (مسمی الكفر وملحقاتە : ناوی كوفر و پاشكۆكانی ) وە نێوان ( مسمی الشرك وملحقاتە : ناوی شیرك و پاشكۆكانی ) وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە كتێبــی ( مجموع الفتاوی ج : ٢٠ ص : ٣٧ و ٣٨ ) دەفەرمووێت : الله تعالی جیاوازی كردووە لە نێوان ( أسماء و أحكام ) لە نێوان پێش ڕیسالە و دوای ڕیسالە.

" النص الرابع " دەقی چوارەم : شێخ عبداللطیف بن عبدالرحمن آل شیخ لە كتێبــی ( مصباح الظلام ) لاپەڕە : ٣٢٤ كاتێك كە لەبارەی شێخ محمد دەفەرمووێت ( انه لم یكفر ( لاحظ النفي للتكفیر فقط ) الا بعد قیام الحجة وظهور الدلیل حتی أنه رحمه الله توقف في تكفیر الجاهل من عباد القبور اذا لم یتیسر له من ینبه ( ومع أنه لم یكفره فقد سماه عابدا للقبر ولا یمكن أن یكون عابدا لغیر الله ویسمی مسلما لأن الاسلام والشرك ضدان لایجتمعان ) )واتە : ئێمە كافر ناكەین ( تێبــینی بكە : تەنها نەفی لە تەكفیر

دەکات ) ئیلا پاش ئیقامە حوجە نەبیت وە بەڵگەی بۆ ئاشکرا بیت.تاوەکو شێخ وەستاوە لە تەکفیرکردنی جاهیل لە گۆڕپەرستان ئەگەر هاتوو بۆی ئاسان نەبوو کە هۆشیاری ببیت ( لەگەڵ ئەوەشدا کافری نەکردووە تەنها پێی وتووە : گۆڕ پەرست.بۆیە ناگونجێت بەندەی غەیری الله بیت و پێی بگوترێت ( موسڵمان ) لەبەر ئەوەی ئیسلام و شیرك دژن هەرگیز بەیەکەوە کۆ نابنەوە)

وە هەروەها شێخ عبدالگیف بن عبدالرحمن أل شیخ لە کتێبێکی تریدا بەناوی ( منهاج التأسیس ) لە لاپەڕە : ١٨٧ دەفەرموێت (كان شيخنا يقرر في مجالسه ورسائله أنه لايكفر الا من عرف دين الرسول وبعد معرفته تبين في عداوته.وتارة يقول : اذا كنا لا نكفر من يعبد قبة الكواز ويقول : في بعضها : وأما من أخلد الى الأرض وأتبع هواه فلا أدرى ما حاله ) واتە : شێخمان محمدی کوڕی عبدالوهاب دانی ناوە لە دانیشتنەکانی و ڕیسالەکانی بەوەی کە : ئێمە کەس کافر ناکەین ئیلا ئەو کەسەی کەدینی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم ناسیوە وە پاش ناسینی دوژمنایەتی بۆی بەدیار کەوتووە.وە لە شوێنێکی تر دەفەرمووێت : ئێمە لە کاتێکدا ئەو کەسانە کافر ناکەین کە قوبەی کواز دەپەرستن وە لە هەندێکی تردا دەفەرمووێت : بەڵام ئەوانەی کە شۆڕ کراوەتەوە بۆ ژێر زەوی وە بەدوای هەوا و ئارەزووی خۆی کەوتووە نازانم حاڵی چۆنە.

وە هەروەها شێخ عبداللطیف دووبارە دەفەرمووێت (حتى انه لم يجزم بتكفير الجاهل الذي يدعوا غيرالله من أهل القبور أو غيرهم،اذا لم يتيسر له من ينصحه ويبلغه الحجة التي يكفر مرتكبها ( لاحظ أولا أن النفي للتكفير،ثم لاحظ أنه قال في هؤلاء الذين نفي عنهم التكفير أنه قال عنهم يعبد قبة كذا أو يدعوا غيرالله من أهل القبور فهل يعقل أن يعبدوا غيرالله ويسميهم مسلمين ؟ )) واتە : تاوەکو ئەوەی هەرگیز تەکفیری کەسی جاهلی نەکردووە ئەو کەسەی کە داوا لە غەیری الله تعالى دەکات لە گۆڕپەرستان و

غەیری ئەوانیش تاوەکو ئەوەی بۆی ئاسان نەبـیت و بۆی ڕێك نەکەوێت کەسێك ئامۆژگاری بکات و وە ئیقامە حوجەی بکات ئەوکات کافر دەبـیت بەهۆی هەڵگرتنی ئەم ئیقامە حوجە و ناسینی دین ( تێبـینی بکە : یەکەم : نەفی تەکفیری کەسی نەزان و جاهیلی کردووە.لەپاشاندا تێبـینی ئەوەش بکە کە دەربارەی ئەم کەسانەی کە نەفی تەکفیری کردوون وتوویەتی : قوبەی فلان شت و فلان شت دەپەرستێت یان ئەوانەی داوا و هاوار بۆ جگە لە الله تعالی دەکەن لە گۆڕ پەرستان ئایا دەچێتە عەقڵ پەرستشی بۆ جگە لە الله تعالی ئەنجام بدات ناوی لێبنرێت ( موسڵمان ؟ ) وە ئەو کەسەشی کە خراوەتە گۆڕەوە و ڕۆیشتووە نە پێی دەڵێت( کافر ) و ناوی پێ لێنانرێت.وە ( موسڵمان ) و ناوی لێبنرێت.بەڵکو وەستاوە لەسەری ( توقف ) بەڵام بەهەمان شێوە پێی دەڵێت ( موشریك ) چوونکە تێکەوتنی بۆ نێو شیرك ئەم حوکمەی کە پێی وترا ( موشریك ) لەسەری پشت ڕاست دەبـیتەوە.

## کورتەی قسەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لەم بابەتە :

یەکەم : هەرگیز لەهیچ یەکێك لەو کەسانەی کە غەیری الله تعالی-یان پەرستووە ناوی لێنەناون موسڵمان.

دووهەم : تەنها نەفی ناوی کوفر و کوشتنی لەسەرکردوون.

سێهەم : سیفەتی موشریکی لەسەر ئەو کەسانە جێبەجێ کردووە کە غەیری الله تعالی دەپەرستن.بەڵام کەسی نەزان و جاهیل ئەوانەی کە ئیقامە حوجەیان لەسەرکراوە ئەگەرچی ئەوانیشی بە موشریك داناوە چونکە غەیری الله تعالی -یان دەپەرست.بەڵام تەکفیری نەدەکردن ئیلا مەگەر پاش ئیقامە حوجە نەبـیت.

# بەشی شەشەم

**هەندێك وتەی ڕوونكەرەوەی قوتابـیانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهاب – بەڕەحمەت بـیت – لەسەر ئەم بابەتە.بەتایبەت ئەو قوتابـیانەی زۆر لە خزمەتی شێخ بوونە و مولازەمەی زۆریان كردووە كە نزیكەی ( یازدە ) وتە و دەق دەبـیت ئەوانیش ئەمانەن :**

**یەكەم : یەكێك لە نەوەكانی شێخ حەمدی كوڕی ناصر دەفەرمووێت (لما سئلوا أن المؤمن بالله ورسوله إذا قال أو فعل ما يكون كفرا، جهلا منه بذلك، فلا تكفرونه، حتى تقوم عليه الحجة الرسالية، فهل لو قتل من هذا حاله، قبل ظهور هذه الدعوة، موضوع أم لا؟فنقول: إذا كان يعمل بالكفر والشرك، لجهله، أو عدم من ينبهه، لا نحكم بكفره حتى تقام عليه الحجة" ولكن لا نحكم بأنه مسلم[13]بل نقول عمله هذا كفر، يبـيح المال والدم، وإن كنا لا نحكم على هذا الشخص[14]لعدم قيام الحجة عليه" لا يقال: إن لم يكن كافرا، فهو مسلم، بل نقول عمله عمل الكفار، وإطلاق الحكم على هذا الشخص**

---

[13] تێبـینی بكە حوكمی نەداوە كە ئیسلامە وەناویشی لێنەناوە موسڵمان.

[14] واتە : بە ( اسم الكفر ) وە حوكمەكانی كوفر لە كوشتن و شەڕ و تەعزیب بەڵام جێگیركردنی شیرك ( اسم الشرك )دەكرێت لەسەری.وە ئەوەی بە دواشی دێت لە نەبوونی لێخۆشبوون بۆی نەفی لێناكات. وە ئەگەر ئێمە كاتێ كە حوكم لەسەر ئەو كەسە نادەین لەبەر ئەوەی كە ئیقامە حوجەی نەكراوە واتای ئەوە نیە پێی بلێین : مادەم كە كافر نیە واتە موسڵمانە.نەخێر بەڵكو دەڵێین : كردەوەی كافرانە.بە ڕەهایی حوكم لەسەر ئەم كەسە دەدەین بەدیاری كراوی.بەڵام وەستاوە لەسەر ئیقامە حوجە ئینجا بە دیاری كراوی حوكم دەدەین.بۆیە ئەهلی علم دەفەرموون : هاوەڵانی ئەهلی فیترە لە ڕۆژی قیامەت لە ساحەی عەرەصات تاقی دەكرێنەوە نە حوكمیان حوكمی كافران دەبـیت نە حوكمیان حوكمی چاكەكاران دەبـیت.

بعينه، متوقف على بلوغ الحجة الرسالية. وقد ذكر أهل العلم: أن أصحاب الفترات، يمتحنون يوم القيامة في العرصات، ولم يجعلوا حكمه حكم الكفار، ولا حكم الأبرار)

واته : کاتیّ کە پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی کە کەسێك ئیمانی بە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی هێناوە بەڵام قسەیەك یان کارێك بکات کوفر بـیت بەڵام نەزان بـیت پێی.کافر ناکرێت تاوەکو ئیقامە حوجەی لـەسەرنەکرێت و ڕیسالـەی الله تعالی پێگەیشتبـیت.ئەی ئەگەر کوژرا لـەسەر ئەم حالّە پێش بەدیار کەوتنی ئەم دەعوە موبارەکە ئایا هەمان بابەتە ؟ ئێمە دەڵێین : ئەگەر هاتوو کردەوەی کوفر و شیرکی کردبـیت بەهۆی جەهل و نەزانینەوە یان نەبوونی کەسێك کە ئاگاداری بکاتەوە.ئەوە کافری ناکەین تاوەکو ئیقامە حوجەی لـەسەر دەکرێت.بەڵام بڕیاری ئەوە نادەین کە موسڵمانە.بەڵکو دەڵێین کردەوەکەی کوفرە ماڵ و خوێنی حەڵاڵ دەبـیت.

دووهەم : هەریەك لـە شێخان حسین و عبدالله کە لـە کوڕانی شێخ محمدن (من مات قبل هذه الدعوة ولم يدرك الإسلام، وهذه الأفعال التي يفعلها الناس اليوم، يفعلها ولم تقم عليه الحجة، ما الحكم فيه؟ وهل يسب ويلعن أو يكف عنه؟ وهل يجوز لولده الدعاء له؟ وما الفرق بـين من لم يدرك هذه الدعوة، ومن أدركها ومات معادياً لهذا الدين وأهله؟

فأجابا: من مات من أهل الشرك قبل بلوغ هذه الدعوة، فالذي يحكم عليه: أنه إذا كان معروفاً بفعل الشرك، ويدين به، ومات على ذلك، فهذا ظاهره أنه مات على الكفر[15] فلا يدعى له، ولا يضحى عنه، ولا يتصدق عنه، وأما حقيقة[16] أمره فإلى الله:

---

[15] تێبـینی بکە : ناوی لێنا پێش ئەوەی موشریك بـیت.لـەبەر ئەوەی کردەوەی شیرکی دەکرد و پەرستنی پێدەکرد.وە وتەی کە دەڵێت ( مات على كفر ) واتە : کوفری شیرك.لـەبەر ئەوەشە لـەپاشان دەڵێن : قوربانی بۆ ناکرێت تا الله لـێی خۆش بـیت.ئەوە ئەحکامی موشریکانە.کە الله تعالی دەفەرمووێت (ما كان لـلـنبـي والڕين ءَمنوا أن يستغفروا لـلـمشركين ولو كانوا أولى قربى)

فإن كان قد قامت عليه الحجة في حياته وعاند، فهذا كافر في الظاهر والباطن، وإن كان لم تقم عليه الحجة،فأمره إلى الله. وأما سبه ولعنه فلا يجوز، بل لا يجوز سب الأموات مطلقاً، كما في صحيح البخاري عن عائشة، رضي الله عنها، أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: " لا تسبوا الأموات، فإنهم قد أفضوا إلى ما قدموا " إلا إن كان أحد من أئمة الكفر وقد اغتر الناس به، فلا بأس بسبه إذا كان فيه مصلحة دينية)

واته : هەرکەسێ بمرێت پێش ئەوەی ئەم دەعوەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بگاتێ و نەگات بە دینی ئیسلام.وە ئەو کردەوانەی دەکرد کە خەڵك دەیان کرد لەوکاتەدا واتە خەڵك بت پەرست بوون ئەویش لەسەر هەمان ڕێبازبوو.دەیکرد و ئیقامە حوجەی لەسەر نەکرابوو.حوکمی ئەوانە چیە ؟ وە ئایا جوێنیان پێدەدرێت ؟ یان بە نەفرەت دەکرێن ؟ یان دەستیان لێ هەڵگرین ؟ وە ئایە درووستە منداڵەکانی

---

[16] تێبـینی بکە نەی وت موسڵمانن.

لە وەڵامدا دەڵێن : ئەو کەسانەی پێش ئەوەی دەعوەیان بگاتێ مردوون ئەوە لەسەر شیرك و ئەهلی شیرك مردوون.بۆیە حوکمی ئەوەیان لەسەر دەدەین کە : ئەگەر هاتوو ناسرابوو بە کردەوەی شیرك.وە پەیڕەوەی دەکرد وەك مەنهج و بەرنامە.وە لەسەر ئەوەش مرد.ئەوە زاهیری حوکم دەدەین کە لەسەر کوفر مردووە.نە دوعای بۆ دەکرێت.وە نە قوربانی و خێر و صەدەقەی بۆ دەکرێت.بەڵام ڕاستی دڵ و دەروون و نیەتی ئەوە کاری لای الله تعالی–یە.ئەگەر هاتوو ئیقامە حوجە کرابوو لە ژیانیدا بەڵام دواتر دژایەتی دینی کرد .ئەوە زاهیر و ناوەوەی دڵی کافرە بە الله تعالی.بەڵام ئەگەر هاتوو ئیقامە حوجەی نەکرابوو ئەوە کاری دەچێتەوە لای الله تعالی ئەو ئاگادارە بە دڵ و نیەتی.بەڵام جوێندان پێی یان نەفرەت لێکردن لێی ئەوە درووست نیە.بەڵکو بەشێوەیەکی ڕەها جوێندان درووست نیە هەروەکو لە صەحیحی پێشەوا بوخاری لە دایکی ئیمانداران دایە عائشەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری الله تعالی صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت ( جوێن بە مردووەکان مەدەن.چوونکە ئەوان چوونە بۆلای ئەو شتەی کە پێش خۆیان ڕەوانەی قیامەتیان کردبوو ) ئیلا مەگەر یەکێك بـیت لە سەرانی کوفر و ڕیدە کە خەڵك پێی گومڕا ببوون.ئەوە هیچ شتێکی تێدا نیە کە جوێنی پێبدەیت بەمەرجێك ئەگەر هاتوو مەصڵەحەتێکی دینی تێدابوو.

دوعایان بۆبکات؟  وە جیاوازی چیە لەنێوان ئەوەی کە ئەم دەعەوەی پێنەگەیشتووە.یان ئەوەی پێی گەیشتووە بەڵام دواتر دژایەتی دین و هەڵگرانی کردووە؟

سێهەم : شێخ عبدالعزیز کە قازی شاری ( الدرعییە )بووە (لما سئلوا أن المؤمن بالله ورسوله إذا قال أو فعل ما يكون كفرا، جهلا منه بذلك، فلا تكفرونه، حتى تقوم عليه الحجة الرسالية، فهل لو قتل من هذا حاله، قبل ظهور هذه الدعوة، موضوع أم لا؟فنقول: إذا كان يعمل بالكفر والشرك، لجهله، أو عدم من ينبهه، لا نحكم بكفره حتى تقام عليه الحجة" ولكن لا نحكم بأنه مسلم[١٧]بل نقول عمله هذا كفر، يبيح المال والدم، وإن كنا لا نحكم على هذا الشخص، لعدم قيام الحجة عليه" لا يقال: إن لم يكن كافرا، فهو مسلم، بل نقول عمله عمل الكفار، وإطلاق الحكم على هذا الشخص بعينه، متوقف على بلوغ الحجة الرسالية. وقد ذكر أهل العلم: أن أصحاب الفترات، يمتحنون يوم القيامة في العرصات، ولم يجعلوا حكمه حكم الكفار، ولا حكم الأبرار)

واتە : کاتێ کە پرسیاری لێدەکرێت دەربارەی ئەوەی کە کەسێك ئیمانی بە الله تعالى و پێغەمبەرەکەی هێناوە بەڵام قسەیەك یان کارێك بکات کوفر بێت بەڵام نەزان بێت پێی.کافر ناکرێت تاوەکو ئیقامە حوجەی لەسەرنەکرێت و ڕیسالەی الله تعالى پێگەیشتبێت.ئەی ئەگەر کوژرا لەسەر ئەم حاڵە پێش بەدیار کەوتنی ئەم دەعوە موبارەکە ئایا هەمان بابەتە ؟ ئێمە دەڵێین : ئەگەر هاتوو کردەوەی کوفر و شیرکی کردبێت بەهۆی جەهل و نەزانینەوە یان نەبوونی کەسێك کە ئاگاداری بکاتەوە.ئەوە کافری ناکەین تاوەکو ئیقامە حوجەی لەسەر دەکرێت.بەڵام بڕیاری ئەوە نادەین کە موسڵمانە.بەڵکو دەڵێین کردەوەکەی کوفرەماڵ و خوێنی حەڵاڵ دەبێت.وە ئەگەر

[١٧] پێی نافەرمووێ موسڵمان

ئێمە کاتێ کە حوکم لەسەر ئەو کەسە نادەین لەبەر ئەوەی کە ئیقامە حوجەی نەکراوە واتای ئەوە نیە پێی بلێین : مادەم کە کافر نیە واتە موسڵمانە.نەخێر بەڵکو دەڵێین : کردەوەی کردەوەی کافرانە.بە ڕەهایی حوکم لەسەر ئەم کەسە دەدەین بەدیاری کراوی.بەڵام وەستاوە لەسەر ئیقامە حوجە ئینجا بە دیاری کراوی حوکم دەدەین.بۆیە ئەهلی علم دەفەرموون : هاوەڵانی ئەهلی فیترە لە ڕۆژی قیامەت لە ساحەی عەرەصات تاقی دەکرێنەوە نە حوکمیان حوکمی کافران دەبیت نە حوکمیان حوکمی چاکەکاران دەبیت.

چوارەم : شێخ عبداللە کوڕی محمد کوڕی عبدالوهاب کە کتێبێکی سەر بەخۆی هەیە لەم بابەتە بەناوی ( الكلمات النافعة في المكفرات الواقعة ) کە ئەویش لە کتێبی ( الدرر السنية في الأجوبة النجدية ) هاتووە لە بەرگی : ١٠ لاپەڕە : ١٤٩ کە تێیدا

(في ذكر كلام العلماء المجتهدين أصحاب المذاهب الأربعة فيما يكفر به المسلم ويرتد، وأنهم أول ما يبدون في باب حكم المرتد بالكلام في الشرك الأكبر وتكفيرهم لأهله وعدم عذرهم بالجهل.

فذكر كلام الشافعية" وذكر منهم ابن حجر الهيتمي في كتابه "الزواجر عن اقتراف الكبائر"، في الكبيرة الأولى، ونص على عدم العذر بالجهل في قوله بيان الشرك، وذكر جملة من أنواعه لكثرة وقوعها في الناس وعلى السنة العامة من غير أن يعلموا – أي جهال – أنها كذلك، ونقل كلام النووي في "شرح مسلم" في الذبح لغير الله تعظيما أنه شرك وصار بالذبح مرتدا (وهذا تعيين لأن المنع من الذبيحة لمعين بها)، ونقل كلام أبي شامة في "الباعث"، ونقل كلام صاحب كتاب "تبين المحارم في باب الكفر"، وذكر أنواع من الشرك الأكبر، منها من سجد لغير الله أو أشرك بعبادته شيئا من خلقه" أنه كفر بالإجماع ويقتل إن أصر على ذلك، ونقل كلام الشيخ قاسم في "شرح الدرر"، فيمن دعاء غير الله أو نذر له وأنه كفر، ومن كلام المالكية نقل كلام أبي بكر

